تصویر ابو عبد الرحمن الكردي
فەرهاد پیرباڵ
منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردي - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com
مێژووی هونەری شێوەکاری
لە کوردستاندا
لە کۆنەوە تا پەنجاکان
هەولێر - ٢٠٠٦

# مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا

## لە کۆنەوە تا پەنجاکان

فەرهاد پیربال

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای مێرگ

خاوەن ئیمتیاز
سەرکیس ئاغاجان

سەرنووسەر
محەمەد خۆشناو

ناوی کتێب: مێژووی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا
ناوی نووسەر: فەرهاد پیرباڵ
چاپ و بڵاوکردنەوەی:دەزگای مێرگ -شێوەکاری
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
نەخشەسازیی:نوسینگەی گۆڤار
ژمارەی سپاردن: ٨٥٩ لە کتێبخانەی گشتی هەولێر درلوەتێ
چاپ : چاپخانەی حاجی هاشم / هەولێر

میدیاییەکان، ئاسەوارێکی سەردەمی هەخامەنشی لە پازارگاد - ئێران

ئەگەر تۆ ئەم نووسین و نەخش و نیگارانەی ئێرە خەراپ نەکەیت و بیانپارێزیت، ئاهوورامەزدا لەپشتت دەوەستێت و خێر و بەرەکەت دەخاتە ژیانتەوە...

**داریووش پاشا**
**کەلەکی شاخی بێستوون**
**ستوونی چوارەم**
**دێری ٧٢-٧٦**

**پێشکەش بە**
**کوڕی شیرینم**

**ڕۆدان**

# پێشەکی

شانازی بەوە دەکەم کە ئەم بەرهەمەی من دەبێتە یەکەمین کتێب لەبارەی مێژووی هونەری شێوەکاریی کورد؛ هەوڵدانێکە لەپێناو هیچ نەبێ بە ئەرشیف کردنی ماتێریاڵەکان پاشانیش وەدەستهێنانی دیدێکی گشتی و فراوان لەم بارەیەوە. بە ئانقەستیش زۆر لەسەر کەرەستەکان و هونەرمەندەکان نەڕۆشتووم ئەمەش بۆئەوەی تۆژەرانی دیکەی تایبەتمەندی ئەم بەستێنە بێن لێیان بتۆژنەوە.

هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بێگومان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هیچ کتێبێک، تایبەت بەم کاولە مێژووەی شێوەکاری لە کوردستاندا نەنووسراوەتەوە و پێویستە لەسەرەتادا سەرچاوەیەکی هیچ نەبێ وەک ئەمەی من ساکار لەبەردەستدا هەبێت.

لە ساڵی ١٩٨٧ بەملاوە، کاتێ گەیشتمە پاریس، بیرۆکەی ئەم کتێبە لەلام گەڵاڵە بوو. دەمودەستیش کەوتمە کڕینی تابلۆ و کۆکردنەوەی ئەرشیف و زانیاری لەبارەیەوە. جگە لە سەرچاوە تیۆرییەکان، هەندێک لە زانیارییەکان لە چاوپێکەوتنی هونەرمەندەکانی ئەو ساڵانە ـ خۆیان وەرگیراون، بۆ بەشەکەی دیکەش پشتم بەستووە بە وردبوونەوە و سۆراغی شەخسیی خۆم، لەگەڵ چەند وتارێک لەوانەی بڵاوکراونەتەوە.

ساڵێک پێش دامەزراندنی کۆلێژی هونەر لە زانکۆی سلێمانی دەمویست ئەم کتێبە چاپ بکەم. دامە مامۆستا ئازاد شەوقی بیخوێنێتەوە. ئەویش بۆ مامۆستا عەلی جزلای عەمیدی کۆلێژ پێشنیارکردبوو کە من ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بە قوتابییەکانی پۆلی یەکەمی بەشی شێوەکاری لە کۆلێژی هونەری زانکۆی سلێمانی بڵێمەوە. ئنجا دووای گفتوگۆ لەگەڵ وەزیری ڕۆشنبیریی ئەوسا، مامۆستا جەمال عەبدول، داوایان لێکردم کە بچم ئەم پێشنیارە جێبەجێ بکەم. ئەوە بوو ئیتر چووم بۆ ماوەی ساڵێک (کە ساڵی یەکەمی کۆلێژەکە بوو) دەرسەکەم گوتەوە. شەرەفی ئەوەشم وەرگرت کە بەهۆی ئەم کتێبەوە بوومە یەکێک لە مامۆستایانی دامەزرێنی کۆلێژی هونەری زانکۆی سلێمانی.

کەواتە ناواخنی ئەم کتێبە (هەڵبەتا لەوێدا هەندێ بەشی دیکەم لەبارەی مێژووی هونەری نیگاری شارستانیەتەکانی دیکە و ڕێبازە هونەرییەکانی ئەورووپا زیاد کردبوو) بووە مێتۆدی دەرسی (مێژووی هونەر) لە کۆلێژی ناوبراودا.

بایەخی ئەم کتێبە تەنیا بایەخێکی شێوەکاریی نیە، بەڵکو بایەخێکی مێژوویی و ئەمازە ئارکیۆلۆژی و ئەدەبیشی هەیە. ئەمەش چونکە لەباری کرۆنیکەوە، قۆناغە مێژووییەکان پۆلبەندی کراون و تا ڕادەیەکیش شیتەڵ کراونەتەوە.

له کاتی کاردا گیروگرفتێک جینگلی دەدام: ئایا دەکرێ هونەری یەکەمین ئەو شارستانییانەی لە چوارچێوەی خاکی کوردستاندا سەریان هەلداوە (بەتایبەتی ئەکەدی، ئاشووری، میدیا، ساسانی، هەخامەنشی) بە هی کورد لە قەلەمیان بدەین؟ ئەگەر بلێین «نەخێر»؛ ئەدی بۆچی عەرەب شانازی بە سۆمەرەوە دەکەن؟ بۆچی فارس شانازی بە ساسانی و هەخامەنشییەوە دەکەن - سەرەرای ئەوەی بەشێکی زۆریان لە کوردستاندا داهێنراون؟!

لە هەموو روویەکی زانستی و مێژوویی و هونەری و تەنانەت ئەکادیمیشەوە، بەشێکی زۆر لە هونەری یەکەمین ئەو شارستانییانەی کە لەسەر خاکی کورددا (واتە ئەوانەی لە چوارچێوەی خاکی کوردستاندا) سەریان هەلداوە، بەتایبەتیش ئەکەدی، ئاشووری، میدیا، ساسانی، هەخامەنشی..) بە هی کورد لە قەلەم دەدرێن. چونکە تۆ تەماشاکە: نەخش و نیگارەکانی گوندی بێتواتە (نزیک هەولێر) دەگەرێنەوە بۆ سەردەمی بنەمالەی سێیەمی شارستانیەتی ئوور؛ نەخش و نیگارەکانی کێلەشێن لە مەلبەندی موساسیر لەسەر سنووری کوردستانی عیراق- ئێران کە لە ٨١٤ پ.ز دروستکراون و بریتین لە پەرستگایەک کە دیوارەکانی بە نیگاری رەنگینی خواوەندەکان و چەند گیانەوەرێک رازێندراونەتەوە، لە سەردەمی شارستانیەتی ئوورارتوویەکانی ئەرمەنییەوە دروستکراون، کەچی لە کوردستانن. یان تەنانەت ئەوەتا پاتریک دۆبێدیان، مێژوونووسی فەرەنسی، لە کتێبی (هونەرەکانی ئەرمەن)دا، چاپی مازێنۆد، پاریس ١٩٨٧، ل ٣١٣ دەلێ: گۆرستانەکانی ئەرمەنییەکان، هەروەها هەندێ شێوازی رازاندنەوەی گۆر و کێل نەخشاندنیان، لە شێوازی کوردییەوە وەرگیراون.

جگە لەمانەش، هەموومان دەزانین: کورد بە درێژایی مێژوو هیچ دەولەتێک یان وەزارەتێکی رۆشنبیریی نەبووە کە بتوانێت، وەک دەولەتەکانی کۆنی ئێران و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، هونەری نیگارکێشانی نەتەوەیی خۆی (فارسی، تورکی..) بنووسێتەوە. بەکورتییەکەی: بەشێکمان نەخوێندەوار بووینە و نەمانزانیوە بتوانین بزانین ئەم مێژووە بنووسینەوە، بەشەکەی دیکەشمان (خوێندەوارەکانمان) ئەم مەسەلەیەمان بەلاوە گرنگ نەبووە و بەگەل خودی دەولەتەکە و ئیمپراتۆریەتەکە کەوتووین و کولتووری نەتەوەیی خۆمان لەناو هی ئەواندا تواندۆتەوە و چیمان کردووە هەر بۆ ئەوان بووە و بۆ ئەوان نووسراوەتەوە.

ئەمرۆ، بە هەرچی شێوەیەکی لێکی بدەینەوە، ناتوانین و ناشبێ و ناکرێت کە ئێمە تا هەتایە خۆمان لەم مێژووە جوان و شکۆمەندەی باپیرانمان گێل بکەین. راستە نەمانتوانیوە بە دیدێکی کوردییەوە ئەم مێژووە زێرەوشانە پەرتەوازەیەی خۆمان بنووسینەوە، بەلام لەناکامدا مێژوویەکمان هەر هەبووە. ئەمەتا...

بەم شێوەیە، من لەم کتێبەی خۆمدا بێ پێچ و پەنا و بەشێوەیەکی زەق هەموو ئەو هونەرانەی کە لەسەر خاکی کورد (لە کوردستاندا) دروستکراون، بە کوردیم ژماردووە.

دووەم گیروگرفت: ئایا ئەو هونەرمەندانەی بە رەسەن کوردن و لە کوردستان نەژیاون؛ چ حسابێکیان بۆ بکرێ؟ دەیان لە هونەرمەندە گەورە عیراقی و سوورییەکان یان تەنانەت تورکیایی و ئێرانییەکان بە رەسەن کوردن یان دوو رەگن: شمس الدين فارس، نضال الاغا، موفق الخطيب، فاروق عبدالعزيز، زيد صالح زكي، نوري مصطفى بهجت، محمود صبري، ناهده الحيدري، قتيبه شێخ نوری، کاظم حیدر، فاتح المدرس، سەیف والی. ئایا ئەمانەشم بخستایەتە ئەم کتێبەوە؟ وەلام: بەلێ پێویست وابوو بیانخەمە ئەم کتێبەوە، بەلام لەبەرئەوەی ئەمە بەستێنێکی فراوان و

ئەمرۆیی و کەمێک جیاوازە، جارێ لە چوارچێوەی ئەم توێژینەوەیەدا دەیانخەینە دەرەوە: بۆ توێژینەوەیەکی سەربەخۆیان هەڵدەگرین.

لەم کتێبەمدا -دەمەوێ تا هەتایەش هەر وابم- هیچ مێتۆدێکی ئەکادیمیم پەیڕەو نەکردووە (تەنانەت لە ریزکردنی سەرچاوەکانیش). ئەوەی ویستوومە، زیاتر گەیاندنی کۆمەڵێک زانیاری و پێشکەشکردنی کۆمەڵێک ماتێریاڵ بووە، لەگەڵ چەند دیدێکی ئێستاتیکیی ئەوتۆ کە بتوانێ هەموویان لە بۆتەیەکی مێژووییدا لەیەکتر ببەستێتەوە: لەئاکامدا مێژوویەکی هونەرەکەمان پێشان بدات. بۆ ئەمەش لە یەکەمین شارستانییەتەکانی کوردستانەوە دەستم پێکردووە تا ساڵانی ۱۹۵۰. ئەمەش لەبەرئەوەی -وەک هەموو جارێک دەڵێم: من کارە ئاسانەکان بەجێدەهێڵم بۆ خەڵکی دیکە (بۆ عەمید و نەقیب و پرۆفیسۆر و ئەکادیمییەکان). من لەبارەی قۆناغێک کارم کردووە کە سەخت و ئەستەم بوو، توێژەرانی دیکەش بلا لەو قۆناغەوە دەست پێ بکەن کە ئاسانە. جگە لەمەش قۆناغی نوێی ساڵانی ۱۹۵۰ -۱۹٦۰ کە من ناوم ناوە ئەسلی دووەم، چڕ و پڕتر و بەربلاوترە، توێژینەوەیەکی ئیستاتیکانەی قووڵ و سەربەخۆی گەرەکە کە لێرەدا هەناسەمی سوار دەکرد.

هونەری خۆشنووسی (خطاطی) پەیوەندییەکی زۆری بە شێوەکارییەوە هەبووە و ئەویش هەر لەناوجەرگەی شێوەکاری و ڕازاندنەوەی کتێبەوە چەکەرەی دەرکردووە، بەکورتی: خۆشنووسەکانی کوردستان زۆرن، بۆ نموونە حاجی محەممەد عەلی، ناسراو بە سابیر (۱۸٦۳ ـ ۱۹٤۱) زیاتر لە نیو سەدە خزمەتی ئەم هونەرەی کردووە، تا ئێستاش لە گەلێک شوێنی بەغدا پاشماوەی بەرهەمەکانی ماوە، لە بەغدا تاکە خۆشنووسێکی ناسراو بووە. یان بۆ نموونە حامید ئامێدی (۱۸۹۱ ـ ۱۹۸۲) ناوی مووسا عەزمییە، دیاربەکرییە، هەروەها محەممەد ئەمین یمنی (مەلا ئەمینی کۆیی) کە لە ۱۸٦٤ ـ ۱۸٦۹ لە بەغدا ژیاوە، خۆشنووس و مۆرهەڵکەن بووە؛ یەکەم کەس بووە مۆری لە عیراقدا بڵاوکردەوە یان سەید موحسین، کە خەڵکی سلێمانییە، لە خەتی رقعەدا داهێنەر بووە.

بەداخەوە، ئەم هونەرەشم (خطاطی) دەرهاویشتە دەرەوەی ئەم کتێبەوە و هیوادارم توێژەرێکی پسپۆڕ بەجیا لێی بکۆڵێتەوە.

ئەم کتێبەم لە سێ بەشدا پێشکەش کردووە. بەشی یەکەم: لە کۆنەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەم. بەشی دووەمیش: کرۆنۆلۆژیایەک لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، بەشی سێیەمیش تا ساڵانی ۱۹۵۰ (کە دەکاتە هونەری شێوەکاریی مۆدێرن).

ڕۆڵی هونەرمەندانی ئەسلی دووەمی مۆدێرن (ساڵانی ۱۹۵۰ - ۱۹۷۰) توێژینەوەیەکی سەربەخۆی پێویستە، چونکە چەند هونەرمەندێکی جیاواز دێنە مەیدانەوە: ئازاد شەوقی، محمد عارف، سلێمان شاکر، عەلی جۆلا، سەردار زوهدی، قادر کوردی و چەندین هونەرمەندی دیکە.

لەکۆتاییدا ئاماژە بەمە دەدەم کە ئەم کتێبە، ئەگەر هونەرمەند (قەرەنی جەمیل) نەبووایە، بەم شێوە جوانەی بەردەست چاپ نەدەکرا: چونکە پێنج ساڵ زیاتر بوو هیچ وەزارەت و دەزگایەک نەیاندەزانی مانا و نرخی ئەم کتێبە چییە! قەرەنی جەمیل لەناو تەپ و تۆزی فەرامۆشیدا ڕزگاری کرد و پێشکەشی ئێوەی کرد.

۲۰۰٦/٦/۱

# هونەری نیگاری
# دێرینی کوردستان

مەرەش، کوردستانی تورکیا
سەدەی هەشتەمی پ. ز. مۆزەخانەی ئەرکیۆلۆژی ئەدەنە

# هونەری وێنەکێشان
# لە سەردەمی پێش مێژوودا

**یەکەمین بەرهەمەکانی پێش مێژوو**

لە بواری نیگارکێشاندا یەکەمین بەرهەمە شێوەکارییە داهێنراوەکانی مرۆڤی سەردەمەکانی پێش مێژوو کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە، دەگەڕێنەوە بۆ سالانی ٣٠/٠٠٠ تا ٢٥/٠٠٠ پ. ز. کە یەکێک لەوانە بریتییە لە پەیکەری ژنێک (١١) سم بەرزیەتی. لە (ویلندۆرت) لە نەمسا دۆزراوەتەوە. دەم و چاوی دیار نیە. قاچەکانی کورتن. باریکبینانە نەکراوە.

دووەم کاری دۆزراوە، پەیکەری پیاوێکە، (٢٠)سم بەرزە، لە هەمان سەردەمدا کراوە و لە برنۆ لە چیکۆسلۆڤاکیا دۆزراوەتەوە.

هۆگ هۆنور و جۆن فلێمینگ کە دیرۆکی نیگارکێشانیان نوسیوەتەوە، سەرهەڵدانی نیگار لای مرۆڤی سەردەمەکانی پێش مێژوو، دابەش دەکەنە سەر چوار قۆناغ:

١- قۆناغی هونەری راوچیەکان

٢- قۆناغی هونەری ناو ئەشکەوتەکان.

دیاردەی راو لەناو نیگارەکانی ئەم دوو قۆناغەدا زۆر دیارە: وێنەی بزن و ماموش و ئەسپ لەسەر بەرد؛ بە رەنگی ڕەش، سور، شین. زیاتر ئاژەڵ وێنەی کێشراوە، پیاو زۆر کەم، ئافرەت دەگمەنە.

ئەوگیانلەبەرانەی لە فەرەنسا وێنەیان کێشراوە، لە هەموو شوێنێکی تر وردبینانەتر کراون.

لەسەر دیواری ئەشکەوتەکانەوەیە کە دەستی وێنەکێشان و وردبینی هونەرمەند پێش دەکەوێت. لە باکوری ئیسپانیا، لە ١٨٧٩ وێنەی گامێشێک لەسەر دیواری ئەشکەوتێک دۆزرایەوە، وایاندەزانی هونەرمەندێکی هاوچەرخی «ئەشکەوت دۆست» کردوویەتی: هێندە جوان بوو.

٣- قۆناغی هونەری چاخی بەردینی مێزۆلیتی

٤- قۆناغی هونەری کێڵگەنشینەکان / جوتیارەکان

مرۆڤ لە سەردەمی مێزۆلیتیک بەولاوە، بەهۆی کشتوکاڵ کردنەوە نیشتەجێ دەبێت، خانوو

# مرۆڤی پێش مێژوو - ٢٨٥٠ پێش سەرهەڵدانی نووسین

| بەروار | قۆناغەکان | گرووپە مرۆییەکان، ژیانیان |
|---|---|---|
| یەک ملیۆن ساڵ پ. ز | چاخی بەردینی دێرین<br>یەکەم قۆناغی پێش مێژوو | مەیمونی لە مرۆڤچوو و<br>مرۆڤی لە مەیموونچوو |
| ١٠٠٠٠٠ ساڵ پ . ز | چاخی بەردینی ناوەراست<br>دووەم قۆناغی پێش مێژوو | مرۆڤی نیاندرتاڵ لە ٦٠٠٠٠ تا ٤٥٠٠٠ پ . ز لە ئەشکەوتی شانەدەر (نزیک خەلیفان لە هەولێر ١١٢کم) ژیاوە. |
| ٣٥٠٠٠ پ . ز | چاخی بەردینی باڵا<br>دوایین قۆناغی پێش مێژوو | مرۆڤی نیاندرتاڵ لە ٣٥٠٠٠ - ١٠٠٠٠ پ . ز لە ئەشکەوتی شانەدەر دانەوێڵەی چاندووە. (٧١٤) پارچە ئامێری جۆراوجۆر لە شوێنەواری شانەدەر دۆزراوەتەوە. |
| ٩٠٠٠ یان ٨٠٠٠ پ . ز | چاخی بەردینی تێپیپالیۆتیک | گۆڕانکاری کەش و ژینگە، سەهۆڵبەندانێکی توند و تیژ: دابەشبوونێکی نوێی جوگرافی و تۆپۆگرافیی زەمین. پێشکەوتنی چاخی بەردین. نەژادی سەر بە مرۆڤی ئەمرۆ فراژووتر دەبێت. |
| | چاخی بەردینی مێزۆلیتیک | مرۆڤ بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، لە کوردستان، لە ئەشکەوت و مەڵبەندەکانی کەریم شایەر، زاوی چەمێ، شانەدەر، هەزار مێرد، مەڵبەندی چەرمۆ، چەتاڵ هۆیووک.. کشتوکاڵ دەکات و نیشتەجێ دەبێت، مەڕ و ماڵات بەخێو دەکات و ڕووەک پەروەردە دەکات.<br>بە هەمان شێوە لە ٨٥٠٠ - ٨٠٠٠ لە گەنج دەرە لە کوردستانی ئێران و لە تەل ئاسیاب لە نزیک کرمەشان لە ٨٠٠٠ - ٧٥٠٠ دا. |
| | چاخی بەردینی نیۆلیتیک | |

# پێش مێژوو - ٢٨٥٠

| بەروار | باکووری میزۆپۆتامیا | باشووری میزۆپۆتامیا | ئێران | ئەنادۆڵ و شوێنی تر |
|---|---|---|---|---|
| ٦/٨٠٠ - ٦/٤٠٠ پ . ز | کولتوری چەرمۆ (نزیک چەمچەماڵ): کشتوکاڵ، پەروەردەکردنی ڕووەک، بەخێوکردنی بزن و مەڕ. | | کولتوری تەپەگۆزان و گەنج دەرە | یەکەم بنەگربوونی شارستانیانەی مرۆڤ لە چەتاڵ هۆیۆک |
| ٦/٣٠٠ تا ٦٠٠٠ پ . ز | بۆ یەکەم جار دروستکردنی سیرامیک لە چەرمۆ، بەخێوکردنی بەراز | | بۆ یەکەمجار دروستکردنی سیرامیک لە (تەپەگۆزان) | ڕەسمکردن لەناو ئەشکەوتەکان لە چەتاڵ هۆیۆک. |
| ٦٠٠٠ - ٥٦٠٠ پ . ز | - چۆلکردنی چەرمۆ و دەستپێکردنی کولتوری حەسونە لە دۆڵی دیجلەدا لە باشوری ڕۆژئاوای چەرمۆ | | سەرهەڵدانی سیرامیک لە (گەنج دارە). بەخێوکردنی بزن و بەران | |
| ٥٥٠٠ - ٤٨٠٠ پ . ز | نەینەوای یەکەم و نەینەوای دووەم -تەل حەلەف | - سەرهەڵدانی کولتوری ئوبێد - سیرامیک لە سامەڕا | -تەپەسیالک - کولتووری سووسە | لە ٥٨٠٠ : سیرامیک لە چەتاڵ و هۆیوک و ولاتی گرێک . |
| ٤٥٠٠- ٣٥٠٠ | - تەپەگەورە - لە ٤٣٠٠ بڵاوبوونەوەی کولتوری ئوبێد لە باشوردوە بۆ باکور. | لە ٤٣٠٠ یەکەمین بنەگربوونی مرۆڤ لە نوور (بنەچەی سۆمەرییەکان) - لە ٣٩٠٠ کولتوری نوورک (بنەچەی سۆمەرییەکان) - دروستکردنی سیرامیک | - تەپەسیالک - دروستکردنی سیرامیک لە سووسە. - ٤٥٠٠: یەکەمین گۆڕستانەکان لە لورستان | |

خواوەندی ژن، سەردەمی نیولیتیک ٦٠٠٠ ساڵ پ.ز. (کوردستانی ئێران) .و. مۆزەخانەی تاران.

شێوازی ئارامی. لە گوندی تەل حەلەف دۆزراوەتەوە لە سەر سنووری کوردستانی عیراق - سووریا.

بەرە دروست دەکات، گۆڕان بەسەر کەلوپەل و ئارشیتێکتوری لانە و تەکنەلۆژیا و ئامێرەکانی دادێت. تەنانەت قاپ وقاچاغەکانیشی، وەک لە (تەل حەلەف )ی سەر سنووری باکووری عیراق - سووریەدا دەبینین، دەڕازێنێتەوە. هەروەها خەتی باریک لە کاتی وێنە کێشانی گیانەوەرەکان بەکاردێنێت. زۆربەی ئەشکەوت و مەڵبەندە دێرینەکانی کوردستان، لە چاخی بەردینی مێزولیتیکەوە ( ٨/٠٠٠ پ. ز )، دەیان نەخش و نیگار و سیرامیک و کاری دیتەنیی جۆراو جۆریان تێدا دۆزراوەتەوە، کە دەچنەوە سەر ئەوجۆرە نیگارانەی (پێش مێژوو) کە هووگ هۆنور و جۆن فلیمینگ باسیان دەکەن:

ئەو کۆمەڵە نەخش نیگارانەی (کە ژمارەیان دەگاتە ١٥٠ وێنە ) لە (ئەشکەوتی کچە گەنجەکان ) لە گوندی یەدی سالکیم لە مەڵبەندی ئەنادۆڵ (٧٦ کم لە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری وان ) دۆزراوەتەوە و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٨/٠٠٠ پ. ز، مشتێکن لە خەرواری ئەو گەنجینە وێنەییانەی سەردەمە بەردینەکانی کوردستان.

زۆربەی ئەو نیگارانە بە ڕەنگی سور یان قاوەیی کێشراون. ئەمەش لەسەر تەلاشە بەردەکانی بەردەم ئەشکەوتەکە، یان لەناو ئەوانەی ناوەوەی، یانیش لەسەر دیوارەکانی ناوەوەی ئەشکەوتەکە. فیگەرەکان بەشێکیان بریتین لە ژنە خواوەندەکان لەکاتی سەماکردندا، یان خواوەندی تر کە لەسەر پشتی گیانلەبەراندا وەستاون، یانیش تەنیا وێنەی ئەو گیانەوەرانەی کە تاکو ئەمڕۆش لەسەر فەرشە کوردیەکاندا وێنەیان دەبینین. بەشێکیشیان بریتین لە دیمەنی شکار و ڕاو، هەندێکیشیان ئەو تەداردکە (طقوس ) دینییانەمان بۆ دەگێڕنەوە کە مرۆڤی ئەو چاخە لەناو ئەشکەوتەکەدا سازیان کردووە.

هەمان مەڵبەندی باشووری شاری وان، کە یەکەمیان ٦ کیلۆمەتر و دووەمیان ١٥٠ کم دوورە لە ناوشار، پڕن لەم جۆرە وێنە و نیگارانەی کە هۆگ هۆنور و جۆن فلیمینگ باسیان دەکەن. وێنەکانی گوندی ترشین بەسەر تاشە بەرد و ڕەوەز و قەدپاڵەکانەوە، بە تەواوەتی وەک مۆزەخانەیەک وان لەبەر هەوا و هەتاوی ئەو مەڵبەندەدا. هەر هەموویان بە یەک جۆر تەکنیک

کراون : هەڵکۆڵین یان رنینی بەردەکان. بۆیە دەتوانین بڵێین کە مرۆڤی ئەو سەردەمە بەردینانە، لەو مەڵبەندەدا شێوازێکی هەبووە. ئەم نیگارانەی گوندی ( ترشین) کە مێژووی دروستکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ( ٤/٠٠٠ پ.ز) زۆربەیان بریتین لە گیانەوەر و دیمەنەکانی ڕاو.

مێژوونووسەکان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون، چۆن بۆ یەکەم جار کشتوکاڵ و ئاوەدانی لە کوردستان (لە شانەدەر و هەزارمێرد و زاوی چەمێ ) سەریان هەڵداوە، بە هەمان شێوەش سیرامیک (فخار) بۆ یەکەمین جار لە مەڵبەندی چەرمۆ دروست دەکرێت و پاشان لە تەپەگۆران لە کوردستانی ئێراندا، ئینجا بە مەڵبەندەکانی دیکەی دنیادا بڵاو دەبێتەوە.

کەواتە، ڕاستە : کوردستان یەکەم لانکەی سەرهەڵدانی شارستانیەت و هونەرەکان بووە.

بەم شێوەیە، دەتوانین بڵێین: سەرهەڵدانی نیگار و لەدایکبوونی هونەری شێوەکاری لە کوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پێش مەسیح، واتە بۆ ئەو سەردەمە دێرینە سەرەتاییەی کە کورد لە ئەشکەوت و لە دەشتەکاندا دەژیا.

مەڵبەندی (زاوی چەمێ)، ٤ کم لە رۆژئاوای ئەشکەوتی شانەدەر، بە کۆنترین مەڵبەندی نیشتەجێ بوون لە کوردستانی عیراقدا دەژمێردرێت.

لە چاخی بەردینی ناوەند دا ( ١٣٤٠٠ ساڵ پێش ئەمرۆ )، ئەو کاتەی مرۆڤ لە قەراغ گۆم و دەریاچە و لە دەشتەکاندا دەژیا لە کوردستان، ئامێرەکان پێشکەوتنێکی دیاریان بە خۆوە بینی: ئامێر لە پارچەی بچووکی دار و بەرد و ئێسقان، لە شێوەی ئەندازەیی ڕێکدا دروست دەکران، وەک سەرەنێزە و داس و چەقۆ.

سەبارەت بەوەی کوردستان یەکەمین لانکەی ژیانی کشتوکاڵی بووە لە جیهاندا، یەکەمین شوێن کە نیشانە و ئاسەوارەکانی ئەم قۆناغەی تێدا دۆزرابێتەوە، بریتیە لە ئەشکەوتی (زەرزی) ی سەر بە سلێمانی، کە لە ساڵی ١٩٨٢ دا دۆزراوەتەوە. لەم ئەشکەوتەدا کۆمەڵێک ئامێری بەردینی وردی شێوەی (سەوانی) دۆزراونەتەوە کە شێوەی ئەندازەیی جۆراوجۆریان هەبووە و بۆ دروێنە دانەوێڵە و ڕاو بەکارهاتوون، شایانی باسە، ئەم قۆناغە پیشەسازیە لە مێژووی کۆنی عیراقدا ناوی لێنراوە پیشەی زەرزیی (الصناعە الزرزیە)، ئەمەش لەبەر ناوی ئەشکەوتی زەرزی.

چەندین ئامێری هاوشێوەی ئەوان لە ئەشکەوتی (باڵی کوورا) لە نزیک (سلێمانی) دۆزراونەتەوە (٤)، ئەو ئامێرانە شێوەی ئەندازەییان هەبووە و لە ئاسن دروست کراون، یانیش لە ئێسقانی ئاژەڵ. ئاسەوارەکانی ئەم چاخە بەردینە ناوەندە، بە شێوەیەکی ڕوونتر لە مەڵبەندی کەریم شەهر دۆزراونەتەوە کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی چەمچەماڵ بە ٩٠ کیلۆمەتر. هەروها لەم ناوچەیەدا چەند ئامێرێکی کشتوکاڵی وەکو داس و کوتک و هاوەن، لەگەڵ چەند ئامێرێکی دروێنە و گەنم و رووەک کوتانەوە دۆزراونەتەوە.

کۆڵینەوە لەم ئامێرانە، کە مێژووی دروست کردنیان دەگەڕێتەوە بۆ ١٣٤٠٠ ساڵ پێش ئەمرۆ، ئەوە نیشان دەدەن کە مرۆڤی سەرەتایی کورد لەم قۆناغەدا هەستی هونەری و جوانیی هەبووە، تازە خەریک بووە نیگار و فۆرم ببەخشێتە کەرەستە و ئامێرەکان. تا ئێستاش گەلێک لەو ئامێرانە ( تەور، قاپ و قاچاغ، تیر، چەقۆ.. ) ماون لە ئەشکەوتەکانی هەزارمێرد و چەرموو و زەرزی و باڵی کوورە و شانەدەردا.

لە سەردەمی ژیانی ناو ئەشکەوتەکانیشدا، مرۆڤی کورد وێنەی گیانەوەرانی لەسەر دیواری

ئەشکەوتەکان دەکێشا، بەمەش واتیدەگەیشت کە ئیتر توانیویەتی دەسەلات بەسەر ئەم گیانەوەرانەدا بگرێت.

کەواتە، نەخش و نیگاری سەردەمە دێرینەکانی پێش زایینی مەسیح لە دەشت و دەر و لەناو ئەشکەوتەکانی شانەدەر، چەرمەوو، گردی قالنج ئاغا، زێوە، بەردە بالکە، هەزارمێرد... بە یەکەمین کەرستە نەتەوەییەکانی کورد دەژمێردرێن لە ژیانی هونەری نیگارکێشاندا؛ یەکەمین قۆناغی هونەری نیگارکێشان لای کورد پیشان دەدەن.

سیرامیکەکانی مەلبەندی چەرمۆی کوردستانی عیراق، کە یەکەمین جۆری سیرامیکن لە مێژووی ژیانی مرۆڤدا، زەمینەیەکی زەردیان هەبوە؛ بە ڕەنگی سوور نەخشیان لەسەرکراوە. هێلەکانیان یەکتربڕ بوونە. بە (سیرامیکی بۆیەکراوی چەرمۆ) ناسراون. هاوشێوەیان لە (تەپەگۆران) ی کوردستانی ئێراندا دۆزراونەتەوە. وادیدەچێ یەکێکیان سەرچاوەی ئەوەی دووەم بێت. لە سالانی ٦٣٠٠ - ٦١٠٠ دروستکراون.

بەلام سیرامیکەکانی تەل حەسونە لە باشووری مووسل، کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی مەعدەنی (٥٦٠٠ یان ٥٠٠٠ - ٣٥٠٠ پ. ز) بە شێوەیەکی گشتی ڕەنگین: پەمبە، پرتەقالی، بوننی، دیوارەکانیان ڕەشە. مێژوونووسەکان بەسەر سێ جۆریان دابەش کردوون. هەروەها مەلبەندەکانی / ئەشکەوتەکانی هەزارمێرد لە (دەشتی بەرانانی نزیک سەرچنار لە سلێمانی) و شانەدەر (لە ناوچەی برادۆستی سەر بە هەولێر) و تەل حەلەف (لەسەر سنوری باکوری عێراق - سوریا) و گەنج دەرە لە کوردستانی ئێران و تەل حەسونە: گرنگترین ئەو مەلبەندانەی کوردستانن کە سیرامیک تێیاندا بلاو بۆتەوە و پەرەی سەندووە.

نیگاری سەر ئەم سیرامیکانە، بەشێوەیەکی گشتی شێوەیی یان ئەندازەیی بوونە، زۆربەی جار هێلەکان، لە شێوەی چەماوەییدا یان یەکتربڕبوونە، یەک ڕەنگ یان سێ. فیگەرەکانیش بریتین لە دیمەنەکانی سروشت، گەلا، درەخت، بالندە، ماسی، گیانەوەران.

تۆژینەوە لە نەخش و نیگار و سیرامیکەکانی ئەم چاخانەی پێش مێژوو لەپێناو ئەم ئامانجانەدایە:

١- لەپێناو زانینی ئاستی هونەری - کولتوری ئەو گروپە مرۆییە دێرینانەی کە دەرەنگتر نەژادی کورد پێکدەهێنن.

٢- ناسینی ئاستی چێژ و بەهرە و توانای مرۆڤ و هونەرمەندەکانیان، تەنانەت سود لێ وەرگرتنیشیان بۆ ئەمڕۆ.

٣- لە پێناو ناسینەوەی ئەو پەیوەندییە ئەتنیکی (نەژادی) و کولتورییانەی کە لە نێوان گروپە مرۆییەکان و دراوسێکانیاندا هەبووە

٤- بەتوێژینەوە لەم نەخش و نیگار و سیرامیکانە، ئەوەمان بۆ وەدیار دەکەوێت کە شوێنی دۆزینەوەی ئەم کەرستانە شوێنێکی دێرینە و مرۆڤی کوردی چاخە بەردینەکانیان تێدا ژیاوە.

٥- لەڕوی ئەنترۆپۆلۆژیاشەوە ئەمە ساغ دەکرێتەوە کە چ جۆرە مرۆڤێکی سەر بە کام چاخ لەم شوێنە ژیاوە؟ جۆری جەژن و ئەدارەکە دینی و تیرەییەکانی ئەمجۆرە مرۆڤە چی و چۆن بووە؟ بۆ نمونە لە تەل حەسونەی نزیک مووسل و لە گردی قالینج ئاغای نزیک هەولێر هەندێ جۆری سیرامیک لە شێوەی قاپ و قاچاغ دروستکراون کە مرۆڤی ئەو سەردەمە لە کاتی ناشتنی کۆرپەکانیان دەیانخستە ناو گۆڕەکانیانەوە بۆ ئەوەی لەو دنیا سوودیان لێ وەربگرن.

# هونەری نیگارکێشان
# لە قۆناغی
# یەکەم شارستانییەتەکاندا

پرۆتۆلیترات واتە (چەرخی نیمچە نووسین ٣٦٠٠- ٢٨٠٠) بەو سەردەمە دەگوترێ کە تێیدا نووسین بە شێوە سەرەتاییەکەی سەری هەڵداوە . هەر لەم قۆناغە بەملاشەوەیە، واتە لەدووای سەرهەڵدانی نووسین، کە وێنە و نیگارکێشان پەرە دەستێنن.

لە دەوروبەری ٣٢٠٠ پ. ز لە وڵاتی سۆمەر، ئنجا لە دەوروبەری ساڵانی ٢٨٥٠پ.ز دا، پیکتۆگرافییەکان واتە یەکەم نووسراوە (تێکستە) وێنەییەکان لە سووسە (لە ئێران) سەرهەڵدەدەن.

یەکەم نووسین وتێکستەکانی شارستانیەتی میزۆپۆتامیای باکوور و باشوور، شێوەیەکی وێنەییان هەبوو، زۆربەی پیت و وشەکان لە شێوەی نیگاردا بوونە . ئەم جۆرە نووسینە سەرەتاییەش، ئەمڕۆ پێی دەگوترێ نووسینی بزماری . هەر وێنەیەک واتای شتێکی، مەبەستێکی دەگەیاند. (٦٠٠.-٧٠٠) هێمابوو.

بەم شێوەیە، مرۆڤی مەلبەندی میزۆپۆتامیا، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، توانی دەنگوباسەکانی ژیان و شارستانیەتی خۆی تۆمار بکات.

هەر لەو سەردەمەشدایە ( لەناو نووسراوەکانی سێیەم بنەماڵەی پاشا سۆمەرییەکاندا) بە زمانی سۆمەری، بۆیەکەم جار ناوی شاری ئەربێل لە شێوەی ئوورببیلیۆن دەردەکەوێت .

لەم قۆناغە سەرەتاییەی شارستانیەتی میزۆپۆتامیادا ( شارستانیەتی ئووروک یان سۆمەری) مۆرە خڕ و لوولەییەکان بۆ یەکەمین جار دەردەکەون کە لە بەرد دروست دەکران. وێنەی ئاژەڵ و مرۆڤ یا ئەخشی ئەندازەییان لەسەر بوو. نیشانەیەکی تۆمارکراوی خاوەنەکانیان بوون.

| بەروار | باکووری میزۆپۆتامی | باشووری میزۆپۆتامی | ئێران و شوێنی تر |
| --- | --- | --- | --- |
| ٣٣٥٠- ٢٨٥٠ پ. ز. | -شارستانیەتی نووررووی بنەماڵەیی (بنەچەی سۆمەرییەکان)<br>- کولتوری نەینەوا | نووررووک : قۆناغی پێش سەرهەڵدانی نووسین | - قۆناغێکی شارستانیی پێشکەوتووتر لە سوسە<br>- دەرکەوتنی هیندۆ ئەوروپییەکان |
| ٢٧٠٠- ٢٥٠٠ پ.ز. | کاریگەرێتی کولتوری سۆمەر | دەسەڵاتدارێتی سۆمەرییەکان و زمانەکەیان.<br>- بنەماڵەی کیش. یەکەم کۆشک و تەلارەکان. پێشکەوتنی نووسین. | -شارستانیەتی سوسە.<br>- سیرامیکی وێنەیی.<br>- ئەشکەوتی گەورەی مرۆڤنشین لە لورستان.<br>- دامەزراندنی ئەهرام. |
| ٢٣٥٠- ٢١٥٩ پ.ز | - ئیمپراتوریەتی ئەکەدییەکان: سەرگۆن پاشا<br>- زمانی سۆمەری بەکار دەبرێت<br>- ٢٢٦٠ - ٢٢٢٣ : نارام سین پاشای ئەکەدی. | | |
| ٢٢٤٠- ٢٢٠٠ پ.ز | دەرکەوتنی کولتور و دەسەڵاتی گوتیەکان کە لە ناوچە شاخاویەکان و لورستانەوە هاتبوون.<br>- حاتیەکان لە ئەنادۆڵ. | | |
| ٢٠٠٠- ١٥٠٠ پ.ز | - یەکەم پاشای شارستانیەتی ئاشورییەکان .<br>- دووامین پاشای نووری سۆمەری. نووسینی بزماری سەردەمی ئاشووری<br>- نامە بە زمانی ئەکەدی لە شمشارەی دەشتی رانیە. | - یەکەم بنەماڵەی شارستانیەتی بابلیەکان.<br>- حامورابی قانوون دادەنێت و بەشێکی میزۆپۆتامیای باکوور دەگرێت.<br>- لە ١٥٩٥ حیتیەکان بابل دەگرن. | - شارستانیەتی عیلامیەکان لە سوسە.<br>- لە ١٧٦٠: شارستانیەتی لورستان<br>-لە ١٨٠٠ حیتیەکان ئەنادۆڵ دەگرن و حوورییەکان باکووری سووریای ئەمرۆ. |

لە دوایین قۆناغی شارستانیەتی نووروکی پێش بنەماڵەیی، واتە لە ٣/٥٠٠ - ٣٠٠٠ پ . ز دا کە بە سەردەمی بنەچەی سۆمەرییەکان دەناسرێتەوە، پەیکەرتاشین لەسەر بەرد دێتە کایەوە . خانمی نووروک (٢٠ سم بەرزی: مۆزەخانەی بەغدا)، هەروەها پەیکەری پیاوە ریشنەکە (٢٨ سم بەرزی: مۆزەخانەی نیویۆرک) کە لە تەل ئەسمەر لە باکووری کوردستان دۆزراوەتەوە نموونەی ئەم هونەرەن.

هەر لە هەمان سەردەم و شوێندایە کە هونەر، لە ئەنجامی پەیدا بوونی دەسەڵاتی پاشایەکانی و سۆمەر، دەبێتە ڕەنگدانەوەی دەسەڵات و ڕوخساری پاشا؛ پابەندی ژیانی «سیاسی» دەبێت و بیری «ئیلتزامی هونەری» سەرهەڵدەدات.

مۆزاییک، نوور، سۆمەری، هەزارەی سێهەم، مۆزەخانەی بریتانی

## هونەری سۆمەریەکان

سۆمەریەکان دیار نیە لە کوێوە هاتوون، بەڵام لە سەرەتادا، لە دەوروبەری ساڵانی ٤٠٠٠ پ . ز دا لە شارەکانی نوور، نووروک، ئەریدۆ، لارسا، لاگاش نیشتەجێ دەبن . ئەم نیشتەجێ بوونەی سۆمەرییەکان لەم شارانەدا، بە یەکەم هەنگاوی مرۆڤایەتی دەژمێردرێت بۆ دروست کردنی شارستانیەت : کۆچی مرۆڤ لە گوندە کشتوکاڵیەکانەوە بەرەو دروستکردنی شار و شارستانیەت. ئەوە بوو تیتر توانیان دەسەڵاتی خۆیان وردە وردە بەرەو باکووری میزۆپۆتامیا بگوازنەوە، بینا و کۆشک و تەلار و پرد و بەنداو دروست بکەن، هەروەها یەکەمین نەخشە و پلان بۆ چۆنیەتی پەرەسەندنی شار دابڕێژن.

یەکەمین چامەی مەزنی شیعری لە دنیا، کە بە داستانی گلگامش ناودارە ؛ هەروەها قیتارە زێڕینە مۆسیقاییەکەی نوور کە سەری گایەکی لە زێڕ دروستکراوی پێوەیە و سمبولی لەدایکبوونی شیعر و مۆسیقان، ئەوانیش هەر بۆ سۆمەریەکان دەگەڕێنەوە.

بەهرەی هونەری شێوەکاری سۆمەری، هەم پەیکەر و هەم نیگارەکانی، زۆربەیان لە دینەوە وەرگیراون. زۆربەیان، خواوەندەکان و حاڵەتی نوێژ و پەرستن و کرداری دینی پیشان دەدەن. وێنەی پاشا و شەڕەکانیان لەسەر تەختە و قاپ و قاچاغ و خەنجەرەکاندا نەخش دەکرد .

وێنەی خەڵکی سادە، لە چاو خواوەند و پاشا، بچووکتربوون، ملکەچ . بەڵام گیانەوەران، ناسایی، بە قەوارەی خۆیان وێنە دەکێشران.

پێش سۆمەریەکان، واتە لە سەردەمی چاخەکانی پێش مێژوودا، لەکاتی وێنەکێشان - بەتایبەتی ئەوانی سەر دیوار - زیاتر ڕەنگی ڕەش و سپی و سوور بەکار دەهاتن. سۆمەریەکان هاتن ئەم ڕەنگانەیان خستە سەر ڕەسم و زیاتریان بەکار هێنان: زەرد و قاوەیی، شین، سەوز، بەتایبەتیش لە کۆشک و تەلارەکانی ماڵی.

ئنجا سووری تۆخ و وەنەوشەیی: ئەم ڕەنگانەش لە تەل بەرسیپ دا - لە سەردەمی ئاشووریەکان - یەکجار بڵاوبوونەوە. بەڵام تەکنیکی بەکارهێنانی ئەم ڕەنگانە، جاری هێندە

جۆراوجۆر نەبوون.

زۆربەی توحفە و بەرهەمە وێنەییە دانسقەکانی سۆمەر لە شوێنەواری ئوور دۆزراونەتەوە، کە هی پاشا و شاژنەکانی ئەو مەڵبەندە بوونە. هەندێکیشیان بریتی بوون لە نەخش و نیگاری سەر خشڵ و زێڕ و زیوەکانی ناو تەلارەکانیان؛ باوەڕیان وابوو کە دووای مردن، لەناو گۆڕی خۆیاندا دەیبەن بۆ «ئەو دنیا».

زۆر کەم لە پارچەی هونەری و نیگارە سۆمەرییەکان لە کوردستان دۆزراوەتەوە، لەوانە: نەخش و نیگارەکانی (بێتواتە)ی دەشتی هەولێر، کە مێژویان دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی سێیەمی ئوور. هەر بۆیەش دەبینین چێژ و خاسیەتی ئێستاتیکیی بەرهەمە سۆمەرییەکان لە مرۆڤی شاخاویی کوردستانەوە دوورە: زیاتر بەرهەمی ئەکەدییەکان (کە فەرمانڕەوای کوردستان بوونە) لەگەڵ چێژی شاخاوی و مرۆڤی کورد زۆرتر یەک دەگرێتەوە.

لارسە، ئەکەدیەکان
(۱۹۰۰ پ.ز). لۆڤەر

**هونەری ئەکەدیەکان**

ئەکەدییەکان (۲۳۵ - ۲۱۵۹ پ.ز ). بە سەرکردایەتی سەر گۆن پاشا. توانیان دەسەڵاتیی خۆیان لە کوردستانی عیراقەوە تا ئەنادۆڵ درێژ بکەنەوە. پایتەختیان بریتی بوو لە شاری (ئەکەد ) کە دەکەوێتە ناوەڕاستی عیراقی ئەمڕۆ .

هونەری شێوەکاری لە سەردەمی ئەکەدییەکاندا، بە چەند خاسیەتێک دەناسرێتەوە:

۱- بەکارهێنانی بڕۆنز بۆ دروستکردنی پەیکەر و پارچە هونەرییەکان زیاتر و زۆرتر دەبێت. هەروەها تەکنیک و چۆنیەتی مامەڵەکردنیش لەگەڵ میتاڵەکان پەرە دەسێنێت. ئەمە جگە لە پەرەسەندنی کاری سیرامیک.

۲- نوێکاری و ڕەنگڕێژی و جۆراوجۆرێتیی تەکنیک و کەرەستە و بابەتەکان . ە هیچ بابەتێک نەبوو لە یەکێکی دیکە بچێت لە رووی جوولە و دەربڕین و وردەکارییەکانەوە.

۳-پەیکەرتاشی و هەڵکەندن و نیگارە ئەکەدییەکان، وێنەی خەڵکیان، بە پێچەوانەی سۆمەرییەکان، وەکو خۆیان و لەسەر شێوەی خۆیان - دوور لە ملکەچی بۆ پاشا و دوور لە نزمی و بەندە یی - ڕەسم دەکرد . ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە گوێیان نەداوەتە دین و دەسەڵاتی پاشا.

٤-لە سەردەمی ئەکەدییەکاندا، پەیکەرتاشی و هەڵکەندن و نیگار کێشان، بە شێوەیەکی زۆر و بەرچاو لە کوردستاندا زیاد دەکات . ژمارەیەکی زۆر لە هونەرە دیتەنیەکانی سەردەمی ئەکەدییەکان لە کوردستان دۆزراوەتەوە، بۆ نموونە :

گلگامش، کوردستانی تورکیا سەدەی نۆیەمی پ.ز

أ -لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ دا پارچەیەکی هونەریی دانسقەی لە بڕۆنز دروستکراو، لە سەر ڕێگەی نێوان سمێل و ناحیەی العاص ی سەر بە زاخۆ دۆزرایەوە کە بە گەوێکی گرنگ دەژمێردرێت نەک تەنیا بە گوێرەی پەرەسەندنی مێژووی شێوەکاری لە میزۆپۆتامیا بەڵکو لە هەموو دنیا . هونەرمەندی ئەکەدی، ئەم نموونەیەی لە سەرەتادا لەسەر قوڕ دروستکردووە، پاشان بە مۆم و قیر، ئنجا لەدواییدا لەرێگەی قالبێنیکەوە کلێشەی بۆ گرتۆتەوە و کردوویەتی بە بڕۆنز.

ئەم تەکنیکە هونەرییەش پێش سەردەمی ئەغریقیەکان دەکەوێ بە چەندین سەدە. ئەم پارچە هونەری لە بڕۆنز دروستکراوە بریتیە لە پەیکەری پاشای ئەکەدیەکان (ئەرام سین)، لەسەر بنکەیەکی بازنەیی دانیشتووە و چەکێکی لە نێوەڕاستی هەر دوو قاچەکانی خۆی ڕاگرتووە. ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی بەغدا پارێزراوە.

ب - ئەخشە هەڵکەندراوەکانی (ئانۆ بانینی) لە نێوان کرماشان و قەسری شیرین، کە لە سەردەمی ئەکەدی ( ٢٤٧٠ - ٢٢٨٥ ) دروستکراون.

ج- ئەخشە هەڵکەندراوەکانی (دەربەندی گاور) لە باشووری قەرەداغ، کە چەندین وێنەن، یەکێک لەوانە جەنگاوەرێکی ڕیشن کەوانێکی لە دەستە و ( ١٠ ) پێ بەرزە. لە سەردەمی ئەرام سین پاشا (٢٢٩١ - ٢٢٢٥ ) دروستکراوە.

د- ئەحت و ئەخشە زێڕینەکان، هەڵکۆڵدراوەکانی سەر بەرد کە پڕن لە وێنە و خواوەند و شەخسیات. لە گوندی (گوندۆک)ی سەر بە ئاکرێ دۆزراوەتەوە و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پ . ز .

# هونەری نیگار
# لە قۆناغی شارستانیەتەکانی دیکە
# لە کوردستاندا

خواوەندی ئاشووری

وەک د. جەمال رشید لە (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لە وڵاتی کوردەواری) لێی کۆڵیوەتەوە، لە ماوەی هەزار ساڵەکانی پێش حەزرەتی مەسیح دا، جگە لە سۆمەری و ئەکەدیەکان، دەیان شارستانیەتی دیکە لە کوردستاندا هەبوونە و بەشدارییان کردووە لە پێکهاتنی «ناسنامەی کورد».

ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتەکانی (ئاشووری)، (بابلی)، (گووتی)، (حیتی)، (خالدی)، (حووری)، (کاسی)، (میتانی)، (مانی)، (عیلامی)، (ئارامی)، (میدیایی)، (نووراتوومیی) و (ئەخمینیەکان).. هەموویان لە ماوەی ساڵانی دوو هەزار پێش لە دایکبوونی مەسیحەوە، هەر یەکەیان لە سەردەمێکدا و لە شوێنێکی جیاوازدا کوردستانیان لەژێر دەسەڵاتدا بووە : کاریگەریتی خۆیان هەبووە بۆ سەر پێکهاتنی (زمانی کوردی) و (نەژادی کورد).

لە ساڵی( ٤٠١ پ. ز)دا ئێگزەنەفۆن لە ئاناباز دا دەڵێ: «خانووی کاردۆخەکان: ڕازاوە، پڕ بوون لە هەموو جۆرە قاپ و قاپچاغێکی لە بڕۆنز دروستکراو. جۆرە شەرابێکی خۆشی ئەوتۆ لەناو ئەو خانووانەدا هەبوو کە یۆنانییەکان بۆ پاراستنی خستیانە ناو چاڵەشەرابی چیمەنتۆییەوە».

# شارستانیەتەکانی دیکە لە کوردستاندا

| بەروار | مێژۆ باکوور | مێژۆ باشوور | ئێران و ئەنادۆڵ و سووریا |
|---|---|---|---|
| ١٥٠٠-١٣٠٠ پ.ز | -لە ١٥٠٠: ئیمپراتۆری میتانی<br>-لە ١٣٩٢ سەرهەڵدانەوەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری | - لە ١٥٠٠: بنەماڵەی کاسیەکان<br>- حیتیەکان<br>لە ١٣٧٥-١٣٧٠ مەلبەندی (واشۆکانی)ی سەر بە ئاشوورییەکان دەگرن | - کاسیەکان لە ١٣٣٠ سوومە دەگرن<br>- لە ١٣٨٠-١٣٤٥ ئیمپراتۆریەتی نوێی حیتیەکان |
| ١٢٣٤-١٠٠٠ پ. ز | ئاشووری و بابلیەکان<br>-نەبووخوزنەسری پاشای بابلی ١١٢٦-١١٠٥<br>- ئاشور ئاسرپالی یەکەم ١٠٥٠ - ١٠٣٢<br>- ئەمروود<br>- ١٢٠٠ : سەرهەڵدانی دینی جولەکە . | | - عیلامیەکان<br>- ئاسن و گۆڕستانەکانی لوڕستان لە ١٠٥٠ |
| ٩٥٠ پ.ز | ئاشوورییەکان<br>- میرنشینی ئارامیەکان لە تەل بەرسیپ<br>- تەلاردکانی تەل حەلەف | - عیلامیەکان لە مێژوپۆتامیای باشوور و ئێران<br>- ئاسنی لوڕستان<br>- حەسەنلوو: سیالک لە ئێران<br>- ئاشووریەکان لە ٩٠٠ ئەرمینیا و لە ٨٨٠ زاگرۆس دەگرن: لە ٨٢٩ش مانیەکان لەناودەبەن | |
| ٨٩٠- ٧٣٥ پ. ز | - ئاشووریەکان حەران و تەل بەرسیپ و تەل حەلەف دەگرنەوە .<br>- لە ٨٠٠ و ٧٩٠ ئیمپراتۆریەتی ئوراتوو تا فوراتی داگیر کردووە. | | - ناو دەرکەوتنی میدیاییەکان لەناو نووسراوی ئاشوورییەکاندا لە ٨٣٨<br>- قەڵای باباگیسان لە لوڕستان لە ٨٥٠<br>- دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی ئوراتووی ئەرمەنیەکان لە ٨١٠ - ٨٢٠ کە دەگەنە زێی فورات و مانیەکانی ئێران تێکدەشکێنن |

## شارستانیەتەکانی
## دیکە لە کوردستاندا

| بەروار | مێژوو باکوور | مێژوو باشوور | ئێران و ئەنادۆڵ و سووریا |
|---|---|---|---|
| ٧١٧-٦٤٦<br>پ.ز | - بنیــــاتنانی خورساباد لەلایەن ئاشووریەکانەوە<br>-ســـەنحـــاریب پاشــای ئاشــووری (٦٨١-٧٠٤) | -لە٦٧٥ عیلامی و بابلی یەکـــان ڕێکەوتنامـــەیەک مـــۆر دەکـــەن دژ بە ئاشووریەکان | -لە ٦٦٠ ئاشـــووریـــەکـــان مەڵبەنددکانی ژێر دەستی مانیەکان داگیر دەکەن . |
| ٦٤٦-٦٢٥<br>پ. ز | ئاشووریەکان لە ٦٥٣ عیلامیەکان لەناو دەبەن ، هەروە ها لە ٦٤٦ دەسەڵات بەسەر مەڵبەندی بابلییەکاندا دەگرن . لە ٦٣٩ سروس دەگرن . | | -سیرووسی یەکەم پاشای پێرس لە ٦٤٦ . |
| ٦٢٥- ٥٥٠<br>پ.ز | **میدیایی و بابلییەکان**<br>- ئیمپراتۆریەتی ئاشوری لە ماوەی ٦٢٥ - ٦٠٩ دا دەسەڵاتیان کۆتایی پێ دێت .<br>- لە ٦٢٥ میدیاییەکان دەسەڵات پەیدا دەکەن و ئەگباتان (هەمەدان) دەکەنە پایتەختی خۆیان . یەکەم پاشای میدیا : سیاکار.<br>- لە ٦٢٣ میدیاییەکان لە شەڕێکدا ناتوانن نەینەوا داگیر بکەن ، لە ٦٢٠ لەشکری خۆیان بەهێز دەکەن و لە ٦١٥ (ئاراپخا - کەرک،،کی ئەمڕۆ) دەگرن.<br>- لە ٦١٤ : هاوپەیمانی میدیایی و بابلییەکان ، شاری (ئاشور)ی نزیک هەولێر دەگرن.<br>- لە ٦١٢ : میدیاییەکان نەینەوا دەگرن ، ئینجا لە ٦٠٩ (حەران) و (تووشاپا)ش . مەڵبەندەکانی ژێردەستی ئوراتۆ دەکەوێتە ژێر دەستی میدیا .<br>- بڵاوبوونەوەی دینی (زەردەشت) و کتێبی (ئاڤێستا) .<br>- پاشای دووەمی ئیمپراتۆریەتی میدیا ، ئاستیاژ (٥٨٤ - ٥٥٠)<br>- سیرووسی دووەم ، پاشای ئەخمینیەکان (٥٥٩ - ٥٣٠) لە ٥٤٩ ئەکباتانی (هەمەدانی ئەمڕۆ)ی ئیمپراتۆریەتی بابل دەگرێت و کۆتایی بە دەسەڵاتی بابلییەکانی و میدیا دێنێ. | | |

کەواتە، کاردۆخەکان هەر لەو سەردەمەوە (لەوانەیە لە پێشتریشەوە) برۆنزیان ناسیوە و زانیویانە بۆ ژیانی شارستانی سوود لە برۆنز و بەکارهێنانی میتاڵەکانی دیکە وەربگرن.

یان بۆ نموونە: میتانییەکان کە لەگەڵ هیندوئەوروپییەکان لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمدا (١٥٠٠- ١٤٠٧) هاتنە کوردستان و تێکەڵ بە خوورییەکان بوون، هونەر و ناسەوارێکی زۆریان لە مەڵبەندەکانی کوردستاندا جێهێشتووە. شاری نووزی لە نزیک کەرکووک گرنگترین مەڵبەندی میتانی و خوورییەکان بووە. سیرامیکی زەغرەفەکراوی پڕ لە وێنەی لێ دۆزراوەتەوە. هەروەها ئەختامی لوولەیی جۆراوجۆر کە پێکهاتەی شێوەکاریی نامۆیان هەیە. ئەمە جگە لە نیگار و نەخشی سەر زێڕ و بەرد و پەیکەرەکانی گوندۆک لە قەزای ئاکرێ.

کەواتە مرۆڤی وڵاتی کوردەواری (کوردستان) پێش ئەوەی هێشتا نەژادەکان بەم شێوەیەی ئەمڕۆ دەربکەون، بەشدارییەکی گەورەی کردووە لە هونەری نەخش و نیگار و ئارشیتێکتور و پەیکەرتاشینی ئەو شارستانیەتانەی ناومان بردن.

محمد پدرام (تمدن مهاباد، طهران: ١٩٩٤) پێی وایە کە نەژادی گووتییەکان لەگەڵ مانناییەکان، پاش تێکەڵ بوونی مانناییەکان لەگەڵ مادەکان، دەبێ بەیەک شت دابنێن و سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ بەدلیس و ناوچەکانی مووش. کووشی یاکاسییەکان کە هەمان لقەکانی ئەمڕۆن لە کێوە سەخت و چڕەکانی بەختیار و لوڕستاندا نیشتەجێ بوون کە نزیکایەتێکی زۆریان لەگەڵ قەومەکانی هووری، مانایی و گووتی هەیە. شیوان یان سیروان شارێک بووە لە دەوروبەری باکووری بلووک سیمرەو ئێستا شوێنەوار و وێرانەی زۆر لە ناوچەی پشتکوە و کەبیرکوە واتە لای ڕاستی ڕووباری سیمرە ماون کە زۆریەیان لە بەرد و گێچن و هی دەورەی ساسانییەکانن.

بەشی کورد، واتە دەسڕەنگینی و کارامەیی مرۆڤی دێرینی کورد، لە بنیاتنان و پەرەسەندنی هونەری ڕەسم لای شارستانیەتەکانی میزۆپۆتامیادا ئاشکرایە، بەتایبەتیش لەو ناوچە و مەڵبەندانەی کوردستاندا کە بەرهەمەکانیان تێدا دۆزراوەتەوە: لوڕستان، زێوێ، خورساباد، تەل بەرسیپ، کێلەشین، کەلەکین، کۆیە، وان، قەسری شیرین، دەربەندی گاور، زەرزی، تەپە سەراب، ئەشکەوتی قزقەپان، کێوی حەریر، ماڵە میر (بەختیاریەکان).

تۆژینەوە لە نەخش و نیگار و پەیکەر و ئارشیتێکتووری وڵاتی کوردەواری لە سەردەمی هەموو ئەم شارستانیەت و دەوڵەتانەدا لچک و لێوی باسەکەمان بەرە و قووڵایی شوێنەوارناسی و مێژووی دێرین درێژدەکاتەوە، بۆیە، لێرە دا، بەکورتی ڕووناکی دەخەینە سەر تەنیا مشتێک لە خەرواری ئەو گەنجینە دیتەنیانەی وڵاتەکەمان کە بە سامانێکی هونەریی ئەتەوەییمان دەژمێردرێن.

بەشێکی هونەری نیگارکێشانی ئاشووری بە تایبەتی ئەوانەی لە مەڵبەندەکانی کوردستاندا ڕە سم کراون، بە سامانێکی دێرینی ئەتەوەیی کورد دەژمێردرێن. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەم بەرهەمانە بە دەست و دڵ و ناوەزی مرۆڤی کوردەواری و لەسەر خاکی کوردستاندا ئەنجام دراون : خەون

وغەم و شەڕ و ژیانی ئەوسای ئەم وڵاتەیان دەربڕیوە.

ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان کە لە ماوەی ساڵانی ۱۸۰۰ تاکو ۶۰۹ پ. ز دا بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەی وڵاتی کوردەواریدا ڕاخستبوو، نیگار و شوێنەوارە دیتەنییەکانی خۆیان لە گەلێک ناوچەی کوردستاندا جێ هێشتووە. ئاشوورییەکان لە باکووری عیراقی ئەمڕۆدا لە ۵۰۰ کیلۆمیتریی باکووری بابل لە دەوروبەری شارەکانی ئەربیلا(هەولێر) موصل(نینوا)و کالا(قلا)و دەوروبەری سلێمانی بەنۆبەی خۆیان شارستانیەتێکی گەورەیان پێک هێناوە.

بەدردەنووسی کێلەشێن بە زمانی ئاشووریە.

## گرنگترین بەرهەمەکانی ئاشوورییەکان
## لە کوردستاندا ئەوانەی خورساباد و کۆیەن:

### ١- ئەوانی خورساباد

خورساباد دەکەوێتە باکوری مووسڵ، لە تەنیشت (دور شارکین)ی یەکێک لە پایتەختەکانی دەوڵەتی ئاشوری کە لەلایەن سەرگۆنی دووەمەوە دامەزرا لە ۷۱۷ پ.ز. چەندین دیواربەند و شوورەی لەسەر ڕەسمکراو، لەگەڵ ۷ دەروازەی پاشایەتی و چەندین ژوور و کۆشک و تەلار و پەرستگای ڕازاوەی وێنە لەسەر کێشراو لەم شوێنەوارەدا دۆزراونەتەوە.

زۆربەی پارچە هونەرییەکانی خورساباد ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس و لە مۆزەخانەی بەریتانی پارێزراون.

### ٢- کۆیە

شوێنەوارناسی فەرەنسی، ئێرنست بابلیۆن، لە کتێبەکەی خۆیدا، گەواهی ئەوە دەدات کە شارۆچکەی کۆیە ژمارەیەکی زۆر لە پەیکەر و بەرهەمە دیتەنیەکانی ئاشوورییەکانی تێدا دۆزراونەتەوە! گرنگترینیان :

أ - دیواربەندێکی ئاشوریانیپاڵ و شاژنەکەی کە لەسەر کورسی دانیشتوون. هەر یەکەو پەرداخێکیان بەدەستەوەیە شەراب دەخۆنەوە. لە مۆزەخانەی بریتانی پارێزراوە. ژنەکە ئادگارێکی پیاوانەی هەیە و پرچی وەکو پرچی پیاو داهاتووە و تاجێکی لەسەرە، جل و بەرگێکی شاهانەی ڕازاوەی لەبەرە.

هونەرمەند وەک لە زۆربەی تابلۆ ئاشوورییەکاندا هەروایە، زیاتر بایەخی داوەتە ئەوەی « ئادگارێکی شاهانە » ڕەسم بکات، نەک وێنەیەکی ڕاستەقینەت پێ پیشان بدات و سیماکانی جوانیی لەش و لاری مێینە یان نێرینە دیار بخات: تەنانەت هێندەش بایەخ نادات دەربڕینی هەست و سۆزەکانیش (غەم، خۆشی...هتد). ئەرنست بابلۆن لەبارەی ئەم شێوازی نیگارکێشانە لای ئاشوورییەکان دەڵێ : « هونەری نیگارکێشانی ئاشوری، هیچ پێناکەنێت : هیچیش ناگریت».

ب - دیواربەندێکی ئاشوریانیپاڵ لەسەر پەیتوونێکی خۆیدا، چوار یاوەری بەدوواوەیە. ژن و پیاوێکیش لە پشتی وەستاون. لە مۆزەخانەی لۆڤەر پارێزراوە.

ج - دیواربەندی شێرێکی بریندار، کە لە مۆزەخانەی بریتانیدا پارێزراوە و لە قەسرێکی ئاشوریانیپاڵ دا دۆزراوەتەوە. ئەرنست بابلۆن، ئەم شێرە بریندارە بەراورد دەکات بە جوانترین بەرهەمی یۆنانیەکان. شێرەکە بە سێ تیری ڕاوچیان پێکراوە و هێزی خۆی لەسەر هەر دوو قاچی پێشەوەیدا کۆکردۆتەوە.

د - پارچە نەخشێکی سەر هەیوانێک، کە لە مۆزەخانەی بریتانیدا پارێزراوە. وێنەی گوڵ و گیا و ڕووەکی، تێکەڵ بە فیگەری ئەندازەیی لەسەر کراوە.

ه - دیواربەندێکی گەورەی چەندین ڕیز کۆیلە و ئەسیر کە گایەکی باڵدار ڕادەکێشن. لە مۆزەخانەی بریتانی پارێزراوە.

هەروەها ژمارەیەک بەرهەمی دیتەنی و دیواربەند و تابلۆی دیکەش کە لە مەڵبەندی (ئاشوور)ی نزیک هەولێر و لە دەربەندی گۆمەل (ناوچەی خنس لە باکوری موسڵ ) هەروەها (قەسری سەنحاریب) و (تەل بەرسیپ) کە شاندێکی فەرەنسی لە ۱۹۳۱ دۆزیانەوە (لە کوردستانی سوریا ) دۆزراونەتەوە.

تابلۆ و دیواربەند و کۆشک و تەلارەکانی تەل بەرسیپ بەشێکی گرنگی هەرە جوانی نیگارەکانی ئاشوری پێکدێنین.

ئێدوین بڤن: (ارض النهرین، ت: انستاس الکرملی، بغداد: ۱۹٦۱، ص ٤۲) دەڵێ:

لە ساڵی (۷۰۱ی پ. ز) دا، سەنحاریب، فەرمانڕەوای هەولێر، ویستوویەتی مەڵبەندی لاکش ئابڵوقە بدات بۆئەوەی ئوورشەلیم کۆنترۆڵ بکات و بتوانێت دەستی خۆی بگەیەنێتە میسر. بابەتی ئەم ئابڵوقەدرانەی لاکش لەلایەن سەنحاریبەوە، لەلایەن نیگارکێشێکی ئەوسەردەمەی هەولێر کێشراوە و ئێستا لە مۆزەخانەی بریتانیا پارێزراوە.

## خاسیەتەکانی هونەری شێوەکاریی ئاشووری
## لە کوردستاندا

۱ - مێژوونووسەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هونەری شێوەکاری لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئاشووریدا، لە چاو هونەری سۆمەری و ئەکەدی، گەشانەوە و پێشکەوتنێکی گەورەی بە خۆیەوە دیوە : ئەمەش بە تایبەتی لە بواری دیواربەند و پەیکەر و هونەری ڕۆلیێف دا. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی خاک و سامانە سروشتیەکانی وڵاتی ئاشوورییەکان (کوردستان) کە وڵاتێکی شاخاویی دەوڵەمەندە و پڕە لە بەرد و تەلاشە بەردی جۆراوجۆری قەوارە جیا کە ئەمەش بە هیچ شێوەیەک لەبەر دەستی سۆمەری و ئەکەدیەکاندا نەبوون لە باشوور و ناوەراستی مێزۆپۆتامیادا. بۆیە دەبینین مرۆڤی مەڵبەندی کوردستانی ژێر فەرمانڕەوای شارستانیەتی

ئاشوری، زیاتر و زۆرتر و باشتر پەرژاوەتە سەر دروستکردنی دیواربەند و نەحت و پەیکەر، لە چاو سۆمەری و ئەکەدییەکان. لێرەشەوە، چێژی مرۆڤی کوردی ئەمڕۆ زۆرتر و زیاتر لە پێوەدانگە ئاشوورییەکانەوە نزیکترە وەک لە سۆمەرییەکان.

ئاشوورییەکان تەنانەت توانیویانە تاشە بەردی مەرمەڕیش (مەرمەڕی مووصل) بەکاربێنن بۆ دیوار بەند و پەیکەری نێو کۆشک و تەلارەکانیان، بۆیە کاری برۆنز پیشە و شێوازێکی دیاری سەردەمی ئاشوورییەکان بوو.

٢) سەرکەوتنە عەسکەری و سیاسیەکانی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری لە جەنگەکانیاندا، هەروەها پەرسەندنی ئیمپراتۆریەتەکەیان، وایکرد بەرهەمە هونەرییەکانیان لەباری چەندایەتی و هەم لەباری چۆنایەتیەوە زۆرتر بەرەو پێشەوە بچن. زۆربەی ئەو شەڕ و شۆڕە سەخت و خوێناوییانەی ئیمپراتۆریەتەکە بەرپای کردووە، لە دیواربەند و پەیکەر و وێنەکاندا ڕەنگیان داوەتەوە. بۆیە دەبینین جەنگ پانتاییەکی فراوانی نیگاری سەردەمی ئاشوورییەکانی داگیر کردووە. ئەمە جگەلەوەی کە ژیانی پڕ سەڵتەنەتی پاشاکانیان لە کاتی ڕاو و شکاردا: هەندێ لە دیمەنەکانی ئاشوربانیپاڵ لەکاتی ڕاوکردندا بە شاکاری هونەری ڕەسم لە جیهاندا دەژمێردرێن.

٣ - زێدەڕۆیی لە گەورەکردنی قەبارە.

هونەرمەندی سەردەمی ئاشوری هەندێ لە فیگەرەکانی، بەشێوەیەکی نائاسایی، گەورەتر لە قەوارەی سروشتی خۆی وێنە دەکێشا: بەتایبەتیش لە حاڵەتێکدا ئەگەر بیویستایە واتای (هێز) و (پیرۆزی) و (ترس) و (ئەفسانە) و (دەسەڵات) بەخشێتە ئەم فیگەرانە. بۆ نموونە (گای باڵدار) و (فریشتەی باڵدار) و (گلگامش) و پاشاکانیان، کە لەچاو خەڵکە ئاساییەکەی خوارەوەی دەورەیان داون زۆر زلتر دیارن.

پاشا ئاشوورییەکان، لەوە دەچێ، بەردەوام لە (مردن) و (شکان) ترساون، بۆیە لەسەر درگای کۆشکەکانی خۆیان، هەمیشە شێری زەبەلاح و گای گەورە گەورەیان ڕەسم کردووە کە بە کەڵلەیەکی مرۆڤانەوە، لەسەر پێ ڕاوەستاون و پاسەوانیتی پاشایان کردووە. هەروەها خواوەندی سەردەمی ئاشووری، زۆر جاران لەسەر پشتی گیانەوەر وەستاون، لەوانە: عەشتاری ئەربەئیلۆ، خواوەندی شەڕ، کە لە تەل بەرسیپ دۆزراوەتەوە، لەسەر پشتی شێرێک وەستاوە و هەنگاو دەنێ. هەروەها تیشوی خواوەند (٩٠٠ پ. ز. لۆڤەر و حەلەب)،(سەرحەدوز پاشا٦٦٩پ.ز:حلب ).

٤) شێوازی دەربڕینخوازی (تەعبیریەت)

دیواربەند و تابلۆی سەردەمی ئاشورییەکان، هەست دەکەی بەردەوام هەر یەکێکیان چیرۆکی ڕووداوێک، قەومانێک یان کارەساتێکت بۆ دەگێڕێتەوە، خاسیەتێکی گێرانەوەییان هەیە، چەندین شت لەیەک کاتدا دەردەبڕێت. هێز، تێکشکان، خوێن، تووڕەیی، هەڵچوون، شاڵاوبردنی سەخت، جەنگ، ڕاو، توندی و گرژی، دیمەنی سەرباز لەکاتی هێرش بردنە سەر دوژمن.. هەموو

ئەمانە لە بزاوت و جووڵەی زۆر دیار و پڕ جۆشدا بەرجەستە کراون.

ئەم جموجۆڵ و شێوازە دەربڕینخوازە لەسەر دەستی هونەرمەندی سەردەمی ئاشوورییەوە پەرەی پێ درا و بەرەو پێشەوە چوو. تەنانەت بیری گەڕان بەدووای ئازادبوون و ئازادیدا، لەڕێگەی شێرە بریندارەکانەوە، یان لەڕێگەی ئاژەڵە ڕامدارەکانی دیکەوە، زۆر بەجوانی خۆی دەرخستووە. تابلۆی ئاشووری، هەمیشە، جووڵە و بزاوتی تێدایە. ئەمە جگە لەوەی تووڵاییەکی سمبوولی و فەنتازی و ئەفسانەیی لەودیو فیگەر و پەیکەرەکاندا حەشار دراون، کە هەندێ جار دەمانبەنە ناو دنیایەکی خەیاڵی و سیحرئامێز، بەڕای ئەندرێ بارۆ، تاکو ئێستاش ئەم ڕەمزانە لێک نەدراونەتەوە.

٥) وردبینی و زەغرەفە و پەرەسەندنی بەکارهێنانی ڕەنگ.

زەغرەفە و ڕەنگ، وەک ئامرازێکی ڕازاندنەوەی جل و بەرگ و کەرەستەی بەدەنی شەخسیاتەکان بەکارهاتوون. لە وێنەکێشاندا هاریکییەکی هونەرمەندانە هەستی پێ دەکرێت لەڕووی دەربڕینی ورد و درشتی سەرجەم بەرزی و نزمی و خاسیەتەکانی ئەو بابەتەی ڕەسمی دەکرێت. هەروەها هونەرمەندی سەردەمی ئاشووری دەیتوانی ڕەنگەکان لە سێ سەرچاوەوە دروست بکات : ڕووەک، ئاژەڵ، کانزاکان ؛ لە هەمان کاتدا تێکەڵ بە یەکتریان بکات و ڕەنگی تازە دروست بکات. بۆیە دەبینین تەنانەت تەحتی سەر دیوارەکانیش بێبەش نین لە ڕەنگی جۆراوجۆری شین و سوور، هەندێ جاریش سەوز و زەرد.

هونەرمەندە ئاشوورییەکان، یەکەمین ئەو هونەرمەندانەن سوودیان لە حەرف و نووسین وەرگرتووە و تێکەڵ بە وێنەیان کردووە بۆ ڕازاندنەوەی تابلۆکانیان، هەرچەندە ئەم کارەیان بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی بابەتە ڕەسمکراوەکە دەکرد، بەڵام بۆتە بەشێک لە جوانی و ڕازاندنەوەی وێنەکە.

تەکنیکی دارشتنی ڕەنگ لای ئاشوورییەکان بەوە دەناسرێتەوە کە پێشتر سنووری فیگەر و ناوتلاینەکانیان بە ڕەنگی ڕەش ڕەسم دەکرد، پاشان بە ڕەنگی شین یا سوور پڕیان دەکردەوە. گەلێک جاریش سنوورەکانیان یەکسەر بە ڕەنگی سوور ڕەسم دەکرد. ئەم تەکنیکە زیاتر لە تابلۆکانی تەل بەرسیپ بەکار هاتووە. ڕەنگی زەرد و سەوزیان بە دەگمەن بەکارهێناوە.

من بۆ خۆم -ئەگەر مافم هەبێ ڕا دەربڕم- هونەری ئاشووریم پێ لە هونەری هەموو گرووپێکی مرۆیی دیکەی ئەو زەمانە، لەلا کوردی ترە.. ( لەگەڵ برۆنزەکانی لوڕستان) پێوەندیی و چێژی ئەمڕۆی کوردانەی من، زۆر جوان دەردەبڕن.

مالەمیر، کێوی بەختیاری کوردستانی ئێران ٨٠٠ پ. ز

# برۆنزەکانی لوڕستان

گرنگترین قۆناغەکانی بەرهەمهێنانی هونەری لوڕستان دەکەوێتە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی تازەی ئاشووریەکان، واتە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ. ز. کە تاکو دەرکەوتنی ئەخمینیەکان (٥٥٠ پ. ز ) دەخایەنێت. ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی لۆڤەر و تاران پارێزراون.

ناودارترین هونەرە دیتەنیەکانی لوڕستان، بریتین لە (برۆنزەکان ) کە ناوبانگێکی هونەری و مێژوویی فراوانیان هەیە لە دنیادا. زۆربەشیان هەڵگرتەنین، واتە مرۆڤ دەتوانێت لەگەڵ خۆیدا هەڵیانبگرێت، کە ئەمەش لەگەڵ سروشتی ژیانی رەوەندی و پێداویستیەکانیان دەگونجێت هەروەها لەگەڵ قەوارەی گۆڕەکانیشیان.

تەور، شمشێر، خەنجەر، شیر، مەرکان، قەڵغان، ئەسپ و گیانەوەرانی دیکە بەشێوەیەکی زەغرەفیی هێندە سەمەرە شێوێنراون کە زۆر جاران ناناسرێتەوە. هەمووشیان بەهایەکی سمبولیان هەبووە، نەک بەهای بەکارهێنان. لەوانەشە کاتی خۆی لە پەرستگاکان دانرابن.

بەم هەموو چەک و دیمەنی ڕاوانەی رەسمیان کردووە، دەردەکەوێ خەڵکی ئەوکاتەی لوڕستان سوارچاک بوونە و زۆر حەزیان لە شەڕ و ڕاو و شکار بووە. زۆر لە دیمەنەکانی ڕاو لەسەر قاپیشی پشت ڕەسم کراون (ئەوانەی لۆڤەر).

وێنەی بزن، شێر، گا، ڕێوی، بەراز، تاژی، کەروێشک، پەلاماری یەکتر دەدەن، جگە لە خەنجەر و شمشێری ڕازاوەی ناجۆر.

هەرچی کەل و پەل و چەک و گیانەوەرێکی دروستیان کردووە، لایەنێکی نامۆی خەیاڵی و ڕەمزی و فەنتازییان خستۆتەسەر، ئەمە خاسیەتێکی دیاری برۆنزەکانی لوڕستانە. هەندێ جاریش گیانەوەریان بەسەری مرۆڤەوە دروست دەکرد، یان ئەندامی زیادەیان بۆ دروست دەکرد.

تەختیتی فیگەرەکان زۆر دیار دەسنیشان دەکرا تا ڕادەی زەغرەفەکاری. ئەمەش بەشێوەیەک کە وێنە بنەڕەتیەکە، هەندێ جار، لەبەر زەغرەفە لاوەکیەکان، ناناسیتەوە.

برۆنزەکانی لوڕستان بە یەکێک لە مەزنترین بەرهەمە دەربڕینخوازەکان دەژمێردرێن لە هونەری شارستانیەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا، تائێستاش گفتوگۆیان لەسەر نەبڕاوەتەوە. ئەمەش تەنیا بۆ چنین و هێز و رەسەنایەتیان ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەش کە دەمانبەنە ناو جیهانێکی نامۆ و سەمەرەی شارستانیەتێک کە لە هیچ شارستانیەتێکی دیکە ناچێت. ئەندرێ بارۆی فەرەنسی، بەراوردی ئەم هونەرە دەکات بە هونەری چینیەکان.

چەکەکانیان، رەوە ئەسپەکانیان، خشڵ و سینی و کەرەستەکانیان، رازاوە، سروشتێکی دەشتەکیانەیان هەیە و یادگاریەکانی سەردەمی کۆنی مێزۆپۆتامیا دەگێڕنەوە.

پرسیاری ئەوەی ئەم پارچە برۆنزە دانسقانە سەر بەکام گروپی ئەتنیکین، بۆچوونی جۆراو جۆر هەیە. مێژوونووسەکان رایان وایە کە یادگاری کاسیەکانن، هەندێکی دیکەش، لەوانە دکتۆر بەهمەنی کەریمی، شوێنەوارناسی ئێرانی، بە دروستکراوی دەستی میدیاییەکانی دەزانێت.

هەرچۆنێک بێت، ئەگەرچی ئەم پارچە برۆنزانە لە ماوەی دەسەڵاتدارێتی ئاشوورییەکاندا، لەماوەی ۱۲۰۰-۶۰۰ پ. ز دروستکراون، بەڵام، وەک ئەندرێ بارۆ دەڵێ «هونەری لورستان بە هیچ شێوەیەک هونەرێکی ئاشووری نییە. هیچ شتێکی هونەری کیش و عیلامیش لە ئەو ناچێت».

هونەری لورستان، هەندێ جار، بەهرەی لە هونەری ئاشوورییەوە وەرگرتووە و تێکەڵ بە شێوازێکی تایبەتی (دەشتەکی) کراوە. جاربەجار هەندێ رەمزی خوازراوە لە شارستانییەتی سۆمەریشەوە دەبینین: بۆ نموونە لە تابلۆیەکدا چوار پیاوی بەیەکتربەستراوی بازنەیی دەبینن کە لەسەر پشتی گایەکن. وەک ئەوەی لە سەمایەکدا بسورێنەوە. ئەمەش رەمزە بۆ خولی خواردنەوەی بازنەییانەی ژیان یان خۆر. ئەم ئەفسانەیەش تاکو ئێستا لای کورد ماوە: «دنیا لەسەر پشتی گایە». هەمان ئەم بابەتە لە تابلۆیەکی سۆمەریدا، لە ۲۰۰۰ پ. ز لە (ماری) دروستکراوە.

سەرەرای کاریگەرێتی شێوازی بابلی و کاشی و ئاشوری و حووری و عیلامییەکان، بەسەر ئەواندا، هونەری لورستان توانیویەتی خۆی لە داب و نەریتە کۆنەکان و دراوسێکان رزگار بکات و شێوازێکی نوێی ئەوتۆ دەربپرێت کە زۆر لە رۆحیات و شێوازی ئەمرۆی مرۆڤی شاخاویی کورد دەچێت.

تازەیی و رەسەنایەتیی برۆنزەکانی لورستان لەوەدایە کە وێنەی مرۆڤ و ئاژەڵ و کەرەستەکانی بەشێوەیەکی ئەندازیاری و پێکهاتەیی خورافی - نەک واقیعی - دروستکردووە کە لە پەرستگا و ئەدارەکە دینی و تایبەتییەکاندا پێشکەش دەکران.

بەشێکی ئەو برۆنزانە دەگەرێنەوە بۆ سەدەی ۷ - ۸ پ. ز. کە کاریگەرێتیی پێشکەوتنی پیشەسازیی میدیاییەکانی پێوە دیارە. ئەوانی دیکەش دەگەرێنەوە بۆ سەدەی ۱۱ - ۱۲ پ. ز. بەشێوەیەکی گشتی. یەکانگیرییەکی پتەوی پیشەسازی و هونەر لە برۆنزەکانی لورستاندا هەیە. ئەم خاسیەتە لە هونەری شارستانییەتەکانی دیکەدا کەم بەدی دەکرێ.

هەندێ لە برۆنزەکانی لورستان گیان و فۆرمێکی بەراستی سوریالیست و فەنتازییان هەیە.

## پارچە هونەرییەکانی زێوە

زێوە یان زێوێ شارۆچکەیەکی کوردستانی ئێرانە، دروستکراوی سەردەمی میرنشینی مانییە لە ساڵانی ۱۰۰۰-۶۰۰پ.ز دا.

قەڵایەکی دێرینی لێیە. نیوەی ئەم قەڵایە و بەشێکی شارەکەش، لە کاتی لەشکەرکێشیی ئاشوورییەکان و سکیتەکان، وێران کراون. پاشان سەر لەنوێ لە کاتی هێرشی ئەخمینییەکان (هەخامەنشیەکان) بۆ سەر وڵاتی ماد (کە داریووش بۆ خۆی لە کەتیبەی بێستوون دا

نووسیوبەتی ولاتی مادی سەرکوت کردووە ) ئەم قەلایە بە دەستی داریوشی هەخامەنشی وێران کراوە.

لە سالی ١٩٤٧ چەند گەنجینەیەکی دەولەمەند و بەربلاوی هونەری نیگار لەم شارۆچکەیەدا دۆزرایەوە کە مێژووی دروستکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی میدیەکان. هەندێکیش دەلێن کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سالانی ٧٠٠-٩٠٠ پ. ز. هەرچۆنێک بێت پێش ئەخمینیەکان ( ٥٥٠ پ. ز ) دروستکراون.

لەوە دەچێ پاشاکانی ئەم مەلبەندە زۆر حەزیان لە خشل و زێر و زیو و خۆرازاندنەوە بووبێ : تاج و ملبەند و قردێلە و تۆقە و بازن و مەچەکبەند و کەمەربەند هەموویان بەکارهاتوون. تەنانەت لە مەلبەندەکانی دیکەشدا بۆ نموونە حامورابی، کاتێ دەچووە بینینی (خواوەندی خۆر ) ملبەندێکی دەبەست. لەوە دەچێ ناوی شارۆچکەی زیوێ - هەر خۆیشی لە وشەی «زیو» هاتبێ: چونکە هەموو ئەم ئاسەوار و گەنجینە جۆراوجۆرانەی لە زیوێ دۆزراونەتەوە: لە زیو یان لە زێڕ دروستکراون. ئەمانەی لێرەدا پیشاندراون مشتێکی خەروارێکن. هەموویان ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی تاران پارێزراون. مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی پێش لەدایکبوونی مەسیح.

وێنەی سەر توحفەکان، زۆربەیان بریتین لە ئاژەلی ئەفسانەیی. ئەمەش لەیەکچوونێکی دیارمان بۆ دەردەخات لەگەل برۆنزەکانی لورستان. دیارە کە دوو تیرەی سەر بە یەک نەتەوەی میدیایی دروستی کردوون.

یەکێک لەو پارچە خشلانە، ملبەندێکی گەورەیە، وێنەی گیانەوەری نامۆی لەسەرە : ئەسپی بالدار ، گای سەر مرۆڤین ، شێری بالدار ، ئاژەلی کێوی، بزن، کەروێشک، سەگ... هەمووشیان بەدەوری درەختێکی پیرۆزدا کۆبوونەتەوە.

هەروەها چەند پارچەیەکی هونەریی دیکە بریتین لە دیمەنی چەند کێلگەیەک کە گیانەوەر لەدووای یەکتر قەتارەیان بەستووە و بەرەو «درەختێکی پیرۆز » هەنگاو دەنێن. هەروەها تابلۆیەکی ناوداری تر کە دیمەنی پێکهەلپڕژانی پیاوێک و شێرێک پیشان دەدات. بەشێکی زۆر لەم تابلۆ و پارچە هونەرییانە لە مۆزەخانەی تاران و لۆڤەر پارێزراون.

هەندێ لە خشلەکان لە ماددەی ئەلکترۆم دروستکراون، بۆ نموونە ئەو بازنەی کە لە هەردوو سەرەوە وێنەی دوو شێری لەسەرە، دەمیان لە یەکتر کردۆتەوە. ئەوانی دیکەش، زۆربەیان لە زیو یان لەزێڕ دروستکراون.

بە بۆچوونی ئاسەوارناسی فەرەنسی، گۆدار، ئەم بەرهەمانە سەر بە «قوتابخانەیەکی ناوچەیی» ن لەژێر کاریگەرێتی ڕاستەوخۆی هونەری ئاشوردا.

بەلام لەلایەکی دیکەشەوە دەبینین ئەو ئاژەلە نامۆ و فەنتازییانەی ڕەسمکراون، هیچ پەیوەندییەکیان بە هونەری ئاشوورییەوە نییە. جگە لەوەش، بۆ نموونە شەڕ و شۆڕەکان و کوشتنی شێر و پلنگەکان، هەموویان - بەپێچەوانەی هونەری ئاشوری لەسەرپێ و بەشێوەی پیادە ئەنجام دراون، بۆ نموونە لەسەر پەیتوون و عارەبانە. بۆیە هەندێ مێژوونووس وای بۆدەچن کە لەژێر تەئسیری شێوازی سکیتی یان نووراتوویی و فینیقیەوە وێنە کێشراین.

بەکورتی : هونەرمەندانی زێویی لە کۆپی کردن و خۆگونجاندن زیاتریان کردووە : شێوازێکی نەوتۆیان داهێناوە کە بلیمەتی ئیمپراتۆریەتی میدیایی واتە ئیشتمانیی «تایبەتی خۆیان» دەربڕێت.

هونەری سەردەمی ساسانی و ئەخمینی، فیگەرەکانی، زەبەلاح بوون و زۆرتر عەقڵ دروستی کردبوون (هەمان خاسیەت لە هونەری پەیکەرتاشیی یۆنانیشدا هەیە). ئەمە لەکاتێکدا هونەرمەندی زێوەیی و بەتایبەتیش لوڕستانی (کە هەردووکیان زۆر لەیەکترەوە نزیکن و تەعبیر لە رۆحێکی کوردانە دەکەن) دیدێکی حسسی و باریکبین و فەنتازییان هەبوو: بۆیەش فیگەرەکانیان ورد و فەنتازی بوو. چاو - نەک عەقڵ - دەیخوێندنەوە. ئەگەر گیانەوەرێکی گەورەشیان دروست بکردایە ئەوا دیسان شێوەیەکی ورد و بچووک، بەڵام فەنتازی و سیحراوییان پێ دەبەخشی.

گەلێک لە مێژوونووسان گەنجینەکانی زێویی یان زێوە بە موڵکی مانناییەکان دەزانن. بەرهەمەکانی زێوی، ئەگەر هی مانناییەکان یان میدیاییەکان یان هی هەر ئیمپراتۆریەتێکی دیکە، لە ناوجەرگەی نیشتیمانی کورد دروست کراون: بەرهەمی دید و ئیستاتیکای مرۆڤی سەرازای ئەم وڵاتەی ئێمەن.

## هونەری میدیاییەکان

میدیاییەکان کە بۆ یەکەمین جار ناویان لە شێوەی نامەدی لە ساڵی ٨٣٦ - ٨٣٨ پ. ز دا لەناو نووسراوی پاشای سەلمان زاری سێیەمی ئاشورییەکاندا دەردەکەوێت، دەسەڵاتیان لە باشووری دەریاچەی ورمێ بەولاوە درێژ دەبۆوە تاکو ئەکباتان (هەمەدان) کە پایتەختیان بوو.

دایکۆ، یەکەم پاشای میدییەکان، هاوپەیمانی ئیمپراتۆریەتی ئوورارتۆ، دژی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری وەستا ؛ تا لە کۆتاییدا سیاکار دەوڵەتی میدیای لە ٦٥٠ پ. ز دا دامەزراند.

سترابۆن، مێژوونووسی گریک، باسی ئەوە دەکات کە سیروسی پارث، کاتێ دەوڵەتی پارث دادەمەزرێنێ و دەوڵەتی میدیا لەناو دەبات، پایتەختی خۆی لە هەمان ئەو شارەدا بنیاد دەنێ کە میدیاییەکانی تێکشکاند، واتە شاری پازارگاد لە باکوری شیراز.

کەواتە، دەردەکەوێت، کە بەشێکی زۆر لە هونەر و شوێنەوارە میعماری و بەرهەمە دیتەنییەکانی میدیاییەکان لە شاری ئەکباتان (هەمەدان) و پازارگاد تێکەڵ بە ئەوانی پارث و هەخامەنشیەکان بووبن. هەر بۆیەش دەبینین شتێکی ئەوتۆ لە هونەر و شوێنەوار و شارستانیەتی میدیا (لەچاو بۆ نموونە ئەخمینی و ئاشورییەکان) نەماوەتەوە.

کەواتە، بەشێکی فراوانی هونەر و شارستانیەت و شوێنەوارەکانی میدیا کەوتنە ژێر دەستی پارث و ئەخمینیەکان (هەخامەنشیەکان).

شوێنەوارناسی فەرەنسی، ئێرانست بابلۆن، هەروەها د. جەمال رشید، بە بەڵگەی زانستیی فراوانەوە ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن : ئەخمینییەکان تەنانەت نووسینی بزماریشیان لە میدیاکانەوە وەرگرتبوو، جگە لە زاراوە دینی و سیاسیەکانیان. بەهەمان شێوە دینی مەزداییش، کە دیانەتی

میدیپەکان بوو، ئەخمینییەکان وەریانگرتووە. ئەمە جگە لەوەی، وەک مێژوونووسە یۆنانیەکان (هێرۆدۆت و گەزنەفۆن) باسی دەکەن پارث و هەخامەنشی و ساسانیەکان هەمان دەستووری پۆشاک و شێوازی لەبەرکردنی جلوبەرگی میدیپەکانیان بەکار هێناوە.

هێردۆت، مێژوونووسی گریک، لە فەسڵی ۹۸ ی کتێبی یەکەمی مێژووەکەیدا، بەفراوانی باسی کەشخەیی میعمار و هونەری ڕەسمکردنی کۆشک و تەلارەکانی میدیاییەکانمان لە هەمەدان بۆ دەکات : «شوورەکانی پایتەختەکەیان ئەستور و زەبەلاح، بەشێوەیەکی بازنەیی، یەک بەناو یەکتردا بەرز دەبنەوە. بریتی بوون لە حەوت بازنە، ئەوەی بورجەکانیشی سپی بوون. بورجەکانی شووری دووەم : ڕەش، ئەوانی سێیەم : سوور، ئەوانی چوارەم : شین، ئەوانی پێنجەمیش : پرتەقالی بوون. هەموویشیان بە زێڕ ئەخش کرابوون. دوو شوورەکەی ناوەوەش بە زێڕ و زیو ڕەنگرشت کرابوون ».

پۆلیبۆسی مێژوونووسی یۆنانی، جەختی لەسەر هەمان ڕاستی دەکاتەوە.

محمد پدرام (تمدن مهاباد، طهران: ١٩٩٤) پێی وایە کە ئیمپراتۆری ماننا لە نزیک گوندی حەسەنلوو لەڕۆژئاوای دەریاچەی ورمیدا بووە، کە لە ٤٥ کیلۆمیتریی باکووری ڕۆژئاوای شاری مەهابادە: (هاوکات لەگەڵ دانەوەی دووچینی چوارەم و پێنجەمی گردی حەسەنلوو قاپە بەناوبانگەکە دۆزرایەوە) هەروەها بەم زوانە شوێنەواری قەلایچی لە نزیک بۆکان دۆزراوەتەوە کە دەردەخا ناوەندی ئەم ئیمپراتۆرە بووە. لە ٨٢٨ پ.ز دا سالمانەسر ئیمپراتۆری بەهێزی ئاشووری چەند جار بۆ سەر ئەم ناوچە ناسراوانەی ئەو کاتی جیهان لەشکرکێشی کردووە و فەرمانی هێرش داوە بۆ سەر وڵاتی ماننا و ناوەندی ئەم وڵاتە قەلایچی ئێستا.

بە سەرنج دان بە چۆنییەتی تاشینی بەردی ئەو دوو شوێنەوارە و شوێنەواری دیکەی لەم چەشنەش، وەک فەرهادتاش و لاچین، هەروەها بە سەرنج دان لە بەڵگە مێژووییەکان وادەردەکەوێ کە ئەو شوێنەوارانە زیاتر لە هی دەورەی مادەکان نزیکن تاکو مانایی (ئەگەر ئەو دوو شارستانییەتە بەجیا دابنێین). ئەگەر پیمان وابێ کە شارستانییەتی ماد تێکەڵاویەکە لە شارستانییەتی ماناو شارستانییەتە بچووکەکانی دیکەی ناوچەکەن، دەبێ پێشمان وابێ کە شێوەی هونەری داتاشینی بەردیی مادەکانیش لە مانناییەکان وەرگیراوە.

ئەشکەوتەکانی ( دوکان داود ) و (کور) و (قز قەپان ) لە نزیک گوندی شرناخ لە کوردستانی عیراقدا هەندێک لە بەرهەمی هونەری و شوێنەواری میدیپەکانی تێدا دۆزراوەتەوە کە بریتین لە وێنە و ئەخشی هەڵکەندراوی سەر دیوار و چەند پەیکەرێک. لە مۆزەخانەی بریتانیشدا لە لەندەن، ئیسطوانەیەک پارێزراوە کە نووسینێکی میدیپەکانی لەسەرە : ئەسپ سوارێک، تاجێک لەسەر، بە ڕمێکی درێژەوە بە گژ شێرێکدا چووە.

گرنگترین سیرامیک و میعمار و ئەخش و نیگاری میدیپەکان، کە تا ئێستا دۆزراونەتەوە، بریتین لەو شوێنەوارانەی کە کەوتوونەتە دیوی کوردستانی ئێرانەوە : تەپە نووشی گیان، تەپەی بابا گیان، گۆدین تەپە، حەسەنلوو، تەپە سیالیک. شوێنەوارناسی فەرەنسی، پییر ئامییێت، لە کتێبەکەی خۆیدا کە لە ساڵی ١٩٧٧ لە پاریس چاپکراوە، بە فراوانی، لەفەسڵێکی تایبەتیدا

لێی کۆڵیونەتەوە.

هەندێ لە مێژوونووسەکان رایان وایە کە بەشێک لە گەنجینە هونەرییە دۆزراوەکانی (زێود ) و بڕێک لە برۆنزەکانی لورستان دروستکراوی دەستی میدییەکانن. جگە لەمەش، وەک مامۆستایان عومەر فارووقی و نوسرەتوڵلا موعتەمەدیش باس دەکەن، سەرجەم هونەر و شوێنەواری مانناییەکانیش ( مانیەکان ) بە موڵکی میدییەکان دەژمێردرێن: ئەمەش چونکە مانیەکان یەکێک بوونە لە تیرەکانی ماد و شکڵی حکوومەت لای مادەکان بە شێوەی فیدراڵی یا کۆنفیدراسیۆن بووە و حکوومەتی ماد لە ۳۰ مەڵبەندی سەربەخۆ دروستکرابوو کە ماننا کان گەورەترین و زاناترینی ئەوان بوون. قەڵای زێوە پایتەختی ئەوان بووە.

## سەردەمی ئەخمینییەکان

| مێزۆپۆتامیا، ئێران، ئەنادۆڵ |
| --- |
| - ۵۵۰ پ. ز ئەخمینیەکان (هەخامەنشییەکان) ئیمپراتۆریەتی میدیا لەناودەبەن و دەسەڵات بەسەر کوردستان و مەڵبەندەکانی دیکەی ئێرانی ئەمڕۆدا دەگرنە دەست.<br>- دەسەڵاتی داریووشی یەکەم ٥٢٢-٤٨٦<br>- داریوشی دووەم ٤٢٣-٤٠١<br>- داریووشی سێیەم ٣٣٥-٣٣٠<br><br>- تێپەڕبوونی دە هەزار سوارە یۆنانیەکە ، بە سەرکردایەتی گەزنەفۆن بە کوردستاندا: دەرکەوتنی ناوی کاردۆخ.<br><br>- جەنگی ئەربێلا: لە هەولێر لە ناوچەی گۆگامێل لە ساڵی (۳۳۱ پ. ز) ئەسکەندەری مەقدۆنی داریووشی سێیەم تێکدەشکێنێ و کۆتایی بە دەسەڵاتی هەخامەنشی دێنێ لە کوردستاندا. هەموو مەڵبەندەکانی کوردستان بۆ ماوەی نزیکەی ۵۵۷ ساڵ، تا ساڵی ۲۲٦ی زایینی، واتە تا هاتنە سەر حوکمی ساسانیەکان، لەژێر دەستی یۆنانیەکاندا دەمێنێتەوە.<br><br>- بەڵگەنامە و نووسراوەکانی ( هەورامان ) بە زمانی یۆنانی کە نیشانەی بڵاوبوونەوەی دەسەڵات و کولتووری یۆنانییە لە کوردستاندا.<br><br>- جەنگی بەردەوام لە نێوان پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی و لەشکری ئەسکەندەری مەقدونی بەتایبەتی لە باشووری ئێراندا.<br>- لەکاتی لە دایکبوونی حەزرەتی مەسیح و دەسپێکردنی سەدەی زاینیدا، کوردستان بەتەواوەتی لەژێر دەسەڵات و کولتووری هێلێنی (یۆنانی)دایە، تا ۲۲٦ ساڵی دیکەی دووای لەدایکبوونی حەزرەتی مەسیحیش. |

## نیگاری کوردی
## له سەردەمی ئەخمینییەکاندا

ئەخمینییەکان ( هەخامەنشیەکان ٥٥٠- ٣٢٣ ) کە دەسەلاتیان تاکو فەلەستین و میسریش درێژ بیوّوە ،لەسەر تاروبۆی میدیاییەکان ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیان بنیاد نا؛ واتە هاتنە سەر حازرەکی. بۆیەش دەبینین ئاهوورامەزدای خواوەندی زەردەشتی پانتایی و دەورێکی فراوانی لە ژیانی پاشایەتی و ڕۆلیتفەکانی هەخامەنشیدا داگیر کردووە. نووسین و دین و جلوبەرگ و هونەری میدییەکان، هەروەها بەشێکی کولتووری بابلی و میسری و یۆنانییەکان، هەمووی، کەوتنە ژێر دەستی خۆیان.

ئەم تێکەلاوبوونەیان بە شارستانیەتی دراوسێکانیان وایکرد هونەرەکەیان جۆراوجۆر و دەولەمەند و «ناوێتەیی» بێت. بۆ نموونە کاردۆخەکان، کە تیرەیەکی کورد بوونە و بە نەژادی کورد دەژمێردرێن، لەو سەردەمەدا دیارە بەشدارییەکی تەواویان هەبووە لە بونیادی کولتووری و میعماری و هونەریدا. ئێگزەنەفۆن لە ئانابازدا باسی چەک و ئامێرەکانیان دەکات و پاشان دەڵێ: «خانووی کاردۆخەکان: رازاوە، پڕبوون لە هەموو قاپ و قاچاغێکی لە برۆنز دروستکراو».

ئارشیتێکتوور و شوێنەوارە مەزنەکانی ئەخمینیەکان دەکەونە سێ مەڵبەندی سەرەکییەوە ؛ یەکەم: شوشان یان سووسە، ئەو شوێنەی کە داریووشی یەکەم و دووەم و سێیەم کۆشک و تەلارەکانی خۆیان لەسەر بنیاد نا و جاران پایتەختی عێلامیەکان بوو و ئاشوربانیپالی ئاشوری وێرانی کردبوو. دووەم: پرسپۆلیس کە تەختی جەمشید و نەقشی ڕۆستەمی لێیە و دەکەوێتە باشوری شوشان. سێیەم: شاری پازارگاد کە دەکەوێتە نێوان شاری ئەسفەهان - شیرازەوە، (تەختی مادەر سلێمان ) و (مەشەد مورقەب)ی لێیە. لەم مەڵبەندانەدا، دەیان ئەختی سەردیوار و شوورە و پێپیلکەکانی، لەگەڵ چەندین پەیکەر و نەخش و نیگاری ناو کۆشک و تەلارەکانی ئەمریی پاشا و کارەکانیان دەگێرنەوە. هەندەسە و جوانیی تەلارەکانیان، بە پلەی یەکەم پشت بە کۆڵەگە و عاموود دەبەستێ.

هونەری ئەخمینیەکان، بەپێچەوانەی هونەری ئاشوورییەکان، وێنەی کوشتار و سامناکی و خوێنی جەنگەکانمان پیشان نادات، بەڵکو زیاتر ئەو شتانەی کە لە جەنگێکی سەرکەوتوودا ماونەتەوە. ئەخمینیەکان لە بواری دروستکردنی خشڵ و بەرهەمە جوانە کانزاییەکانیشدا کارامەیەکی سەرسوڕمێنیان پیشان داوە. سەربازەکانی لەشکری ئەسکەندەری مەقدۆنی زۆر لەم ئەحت و بەرهەمانەیان خاپوور کرد، بەلام ئەو فەخفوری و بازن و ملوانکە و گوڵدان و قاپ و کووپەڵە زیوینانەی ماونەتەوە، دەسەلمێنن کە ماڵ و گۆڕی مردووەکانیان هیچ کەموکورتیەکیان لە ژیانی دنیایی و ڕابواردندا نەبووە.

دووای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی (ئەخمینی) لە ساڵی ٥٥٠ پ. ز دا ئیمپراتۆریەتی میدیای شکاند و خۆی دامەزراند، داریووش پاشای یەکەم لە ساڵی ٥٢٢ دا جڵەوی حوکمی گرتە

دەست؛ دووای ئەمە ئیتر ژمارەیەک ڕاپەڕین و شۆڕش لەلایەن میدیایی و ئوورارتوویی و بابلی و عیلامییەکانەوە دژی داریووش سەری هەلدا. بەلام داریووش توانیی هەموویان سەرکوت بکات؛ ئنجا هات ئەم سەرکەوتنە مێژووییەی خۆی لەسەر کەلەکی شاخی بێستون دا لە نزیک کرماشان تۆمارکرد. ئەمەش لەسەر دیوارێکی ٦ مەتر درێژی و ٣ مەتر بلندی. (١٣) زەلام لە نەخشەکەدا دیارن، (١٢) وەستاون، یەکێکیش لەسەر پشت، لەژێر قاچی داریووش دەپاڕێتەوە. هەموو ئەو زەلامانەی کە بەرامبەر داریووش وەستاون: ٩ کەسن، سەرۆکی ئەو گرووپانەن کە شۆڕشیان دژی داریووش هەلگیرساندبوو، ئێستاش وەک لە تابلۆکەدا دەبینین: دەستبەستراو، بەدیل گیراون. لەسەرەوەی هەمووشیاندا خواوەندی زەردەشتیان (ئاهورامەزدا) دیارە.

پێنج ستونی نووسینی سەر تابلۆکە ئەم تابلۆ مێژووییە ڕوون دەکاتەوە. هەر ستونێک بریتییە لە چەندین بەش، هەمووشیان بەم شێوەیە دەست پێدەکەن : « داریووش پاشا دەلێ..». لەم نووسینانەدا داریووش پاشا دەلێ کە «ئاهورامەزدا پاشایەتی داوە بەمنەو »، « بۆیە ئەگەر دژایەتیم بکەن ئاوها دیلتان دەکەم و ئاهورامەزداش نەفرەتتان لێ دەکات ». داخوازیش لەوکەسانە دەکات کە دووای خۆی دێن ئەم نووسینانە دەخوێننەوە و ئەم نیگارانە تەماشا دەکەن، خراپیان نەکەن و بیانپارێزن، ئەگینا ئاهورامەزدا بەرەکەت لە ژیانیان دەبڕێت.

کەواتە، لەم دوو ڕیزەی دووایی‌دا دەردەکەوێ کە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردستاندا نیگار و نووسین سیفەتێکی پیرۆزی پێ بەخشراوە. ئەم پیرۆزییەش ڕاستەوخۆ بە خواوەندەوە بەندە: ئەهورامەزدا نیگار و نووسینی خۆش دەوێ ، بە هەمان شێوەش پاشا. نیگار لای هەخامەنشیەکان دەگاتە ئاستی دین لە رووی بایەخ و پیرۆزیدا.

هونەرمەند و نیگارکێش هەر چی کەسێک بووبێت، ئەوا پاشا «بەپێی ئەو دەسەلاتەی کە خواوەند پێی داوە» وێنە و نیگار و نووسینی پیرۆز کردووە. ئەمەش، هەرچی لێکدانەوەیەکی بۆ بکرێت، ئەوە ڕەت ناکاتەوە کە ڕێزنان و جیاوێدانکردنی هونەر بووە لەو سەردەمە دێرینەوە! داریووش پاشا، لە کەلەکی شاخی بێستوون لە ستوونی چوارەم، لە دێری ٧٢-٧٦دا دەلێ: « ئەگەر تۆ ئەم نووسین و نەخش و نیگارانەی ئێرە خەراپ نەکەیت و بیانپارێزیت، ئاهوورامەزدا لەپشتت دەوەستێت و خێر و بەرەکەت دەخاتە ژیانتەوە... » ؛ بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، داریووش دەلێ کە ئەگەر خەراپیان بکەیت ئەوا ئاهوورامەزدا ژیان و بەختت وێران دەکات.

ئەمە، گرێدانی هونەرە بە بە بەخت و چارەنووسی ئادەمیزادەوە. کەواتە، لێرەوەیە کە بایەخی پەیام و ڕۆلی هونەر، هەروەها بە کۆمەلایەتی کردنی هونەر دەست پێدەکات. جاران، ڕاستە، هونەر هەبووە، بەلام لای هەخامەنشییەکان، ڕۆشنبیری لەبارەی هونەر و مەعریفەی هونەر و فەلسەفەی هونەریش سەرهەلدەدات.

# هونەری نیگاری کوردی لە سەردەمی ساسانیەکان

لە ٣٣١ پ.ز بەملاوە، واتە لەوکاتەوەی ئەسکەندەری مەقدۆنی لە شەڕی ئەربێللا لە هەولێر داریووش پاشای ئەخمینی دەشکێنێ تا ئەوکاتەی ساسانیەکان لە ساڵی ٢٢٦ی زاینیدا حوکم دەگرنەوە دەست و یۆنانیەکان دەردەکەن، کوردستان لەژێر دەسەڵاتی یۆنانیەکاندا لە کولتووری یۆنانی ئاو دەخواتەوە. کەواتە بۆ ماوەی ٥٥٧ ساڵێک زمان و کولتوور و تەنانەت فیزیک و هونەریشمان دەکەونە بەر زەبری زمان و دین و فیزیک و کولتووری یۆنانییەکانیەوە.

یادگاریەکی شارستانیەتی یۆنانیەکان لە کوردستاندا، لە کێوی نەمروود. میتهریدات پاشای ئەشکانی لە ساڵی ١٠٥ پ.ز دا تەوقە لەگەڵ هێرکلۆس (هەرقەل)ای یۆنانی دەکات.

لە ساڵی ٣٣١ پ.ز واتە لەگەڵ داگیرکرانی کوردستان لەلایەن ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە تاکو ٢٢٦ ز (هاتنە سەر حوکمی ساسانیەکان) واتە نزیکەی پێنج سەد ساڵێک، کوردستان لە ژێر دەسەڵات و کاریگەریتی کولتووری یۆنانییەکاندا بوو. پەیکەر و شوێنەوارەکانی ئەو کاریگەرییە چیای نمرود جوانترین یادگارییەکانی ئەم تەسیرەیە بەسەر هونەری پەیکەرتاشی لە کوردستاندا. دوای دەسەڵاتی یۆنانی لە کوردستاندا، ساڵی ٢٢٦ی زاینی ساسانیەکان دێن فەرمانڕەوایەتیی کوردستان و بەشێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگرنە دەست؛ دینی خەلک لەو سەردەمەی ساسانیەکاندا زەردەشتی و مەسیحی و مانایی و جولەکە بوو.

هەندێ نەخشکاری سەر بەرد لە ئێرانی سەردەمی ساسانیدا گەیشتە لوتکە. گرنگترینیان

# سەردەمی ساسانیەکان

| بەروار | میزۆپۆتامیا، ئێران | ئیسلام |
| --- | --- | --- |
| ٢٢٦ ز | - ئەردەشێری یەکەم پاشای ساسانی. بووژانەوەی دینی مانایی. | |
| ٣١٠ز | شاپوری دووەم پاشای ساسانی باوەش بۆ مەسیحیەت دەکاتەوە لە وڵاتدا. | |
| ٣٥١ز | دیاریکر لە یۆنانیەکان دەسەندرێتەوە | |
| ٣٧٩ز | کۆچی دوایی شاپوری دووەم، هاتنە سەرحوکمی ئەردەشێری دووەم. | |
| ٥٥٠ز | مشیحا زیخا بە زمانی سریانی (مێژووی ئەربێلیلا) دەنوسێتەوە. هەولێر مەڵبەندێکی مەسیحی بووە. | |
| ٥٧٠ز | دیسی زەردەشتی و مەسیحی و یەهوودی لە کوردستاندا هەر باوە. | لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلام ( د. خ. ) |
| ٥٩٠ز | خوسرەوی دووەم : حەکایەتی عەشقی شیرین و فەرهاد | |
| ٦٢٢ز | | هیجرەتی پێغەمبەر (د. خ.) |
| ٦٣٢ز | لە سەردەمی چوار خەلیفەکەی ئیسلام دا ، کوردستان وردە وردە دەکەوێتە بەر هێرش و فەرمانڕەوایەتیی ئیسلام: ئەبووبەکر (٦٣٢)، عومەر (٦٣٤)، عوسمان (٦٤٤)، عەلی (٦٥٦). | |
| ٦٣٧ز | لە سەردەمی یەزگوردی سێیەمدا، سعد بن ابی وقاص لە شەڕی قادسیەدا باشووری عێراق لەدەست ساسانیەکان دەردێنی و دەیکاتە ئیسلام. | |
| ٦٤١ز | مووسڵ دەکەوێتە ژێر دەستی ئیسلام. | |
| ٦٤٢ز | لە شەڕی نەهاوەند: ئاخرین پاشای ساسانیەکان دەکوژرێ. | |
| ٦٥١ز | کۆتایی دەسەڵاتی ساسانیەکان و بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی ئیسلام لە کوردستاندا: بەشێکی زۆر لە کورد واز لە زەردەشتی و مەسیحیەت و جوولەکەیی دێنن و دەبنە ئیسلام. | |

بریتین لە نەخشەکانی تاقوەسان بەقەد پاڵی شاخی بێستوونەوە لە کرماشان کە لەلایەن فەرهادی کۆکەن بە فەرمانی خوسرەوی پەرویز، لە پێناو خۆشەویستی شیرین دا هەڵکەندراون.
دروەوشانەوەی ناوی دوو پەیکەرتاشی دەسڕەنگینی ئەو سەردەمە : (شاپوور ) و (فەرهاد ) نیشانەی پەرەسەندنی ئەم هونەرەن لە کوردستاندا. نەخش و نیگار و پەیکەرە هەڵکۆڵدراوەکانی سەر شاخی بێستوون بە ئاشکرا کاریگەریتی هونەری گریک - بیزەنتی و ڕۆمانییان بەسەرەوە دیارە. جگە لە ئاسەوارەکانی مەڵبەندەکانی قەسری شیرین و بەختیاری و تاقی کیسرا هەروەها پەیکوڵی (لە سلێمانی)، کە لە سەردەمی خوسرەوی دووەمدا دروستکراون، کۆمەڵە یادگارێکی دیاری دیکەی سەردەمی ساسانیەکانن. (تاقی کیسرای دروستکراوی خوسرەوی دووەم لە ساڵی ٦٣٧ بەولاوە لەلایەن دەسەڵاتی ئیسلامەوە کرایە مزگەوت).
ساسانیەکان ئەگەر چی بەردیشیان بۆ داتاشین و پەیکەرتاشی و ڕەسم بەکار دەهێنا، بەڵام زیاتر بایەخیان دەدایە بەکارهێنانی گەچ، کە دواتر ئەمەوی و عەبباسیەکان سوودیان لەم شێواز و تەکنیکەیان وەرگرت بۆ بنیادنانی کۆشک و مزگەوتەکانیان.
سەردەمی ساسانیەکان (٢٢٦ - ٦٥١ )، کە سەردەمی ژیانی مانی ی نیگارکێشە (٢١٥ - ٢٧٤ ز ) بەوە دەناسرێتەوە کە بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا مرۆڤی کورد لەسەر کەرەستەی دیکەی غەیری دار و بەرد و دیوار ڕەسم دەکات، واتە هەوڵدەدات تابلۆی سەربەخۆ ڕەسم بکات.
لەم بارەوە حسێن حوزنی موکریانی دەڵێ : « لە عەسری پێش ئیسلامدا کوردەکان خانوویەکی تاریکیان دروست دەکرد و کونێکی چکۆلەیان تێدا دەهێشتەوە، پیاوێکی عەکسیان وەرگرتبایە، لەبەر ئەو کونەیان دوور ڕادەگرت. ڕەسسام لە ڕۆژی ئەو خانووەدا ڕەسمی دەخستە سەر چتێکی مەطلوب و بە قەڵەم خەریکی دەبوو».
بەهۆی هاتنی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامەوە (٦٥١ ز) مێژووی داهێنانی پەیکەرتاشی لە کوردستانی دێریندا کۆتایی پێ دێ: ئیسلام پەیکەر و وێنە بە «بت» دەزانێت و حەرامی دەکات. مێژوونووسە موسڵمانەکانی سەدەی ٩ - ١٢م باسی ئەوە دەکەن کە هونەرمەندەکان دەستنووسەکانیان بە نەخش و نیگار دەڕازاندەوە و لە پەرستگا زەردەشتیەکاندا دەیانشاردنەوە.
قۆناغی پێش بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام، واتە لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەکانی میدیا و ساسانی و ئاشوورییەکاندا، قۆناغێکی پڕشنگداری هونەری شێوەکاری و پەیکەرتاشی دەنوێنێ لە شارستانیەتی کوردستاندا: پەیکەر و نەخش و نیگارەکانی لوڕستان، نەمروود، دیاربەکر، هەمەدان، مەهاباد، تاقی بێستوون، خڕی گەلالی، کێلەکانی قەندیل، قەلای دیاربەکر و هەولێر.. یادگاری ئەو سەردەمانەی پێش بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلامن.
ئیمپراتۆریەتی ساسانی لە کوردستاندا دوامین ئیمپراتۆریەتی غەیرە موسڵمانە لە کوردستان و ڕۆژهەڵاتدا. بەم شێوەیە، کوردستان لە ٦٥١ بەملاوە دەکەوێتە ژێر زەبری کولتووری ئیسلامەوە و قۆناغێکی دیکە لە بەستێنی شێوەکاری، کە شێوەکاریی ئەبستراکت و میناتۆر و خەتە دەست پێدەکات.
زۆربەی مێژوونووسەکان لەوەدا یەک دەگرنەوە کە لە سەردەمی ساسانیەکاندا، بۆ یەکەمین جار تابلۆ (نیگاری سەربەخۆ ) بەتایبەتی میناتۆری ناو دەستنووس و کتێبان، سەر هەڵدەدات.

# هونەری شێوەکاریی کورد
# لە سەردەمی ئیسلامەوە ٦٣٢ ز

## لە میناتۆرەوە بۆ تابلۆ

میناتۆرێکی کوردی سووریا لە ساڵی ١٢٢٩ دروستکراوە

لە سییەکانی ساڵانی ٦٠٠ی. ز بەولاوە، کوردستان وردە وردە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی عەرەب: نووسینی عەرەبی و زمانی عەرەبی و کولتووری ئیسلام و هونەری ئیسلام و هونەری ئیسلامی - عەرەبی لەناو کورداندا بڵاودەبێتەوە، بە هەمان شێوە دینی ئیسلامیش کاریگەریێتی خۆی بەسەر داب و نەریت و ژیانی ڕۆحیی کورد جێ دەهێڵێ.

بەم شێوەیە، لە هاتنی دینی ئسلام بەولاوە بۆ ناو وکوردان، هونەری پەیکەرتاشی، کە دیارترین و گرنگترین هونەری شێوەکاری بوو لە سەرتاسەری کوردستاندا، (بە بۆچوونی ئەوەی کە بریتیە لە بتپەرستی!) قەدەغە دەکرێت و کۆتایی پێ دێت. حاڵی هونەرەکانی دیکەی نیگاریش دەکەوێتە ژێر سانسۆرەوە یان بەرتەنگ و سنووردار دەبنەوە. هەر بۆیەش دەبینین هونەری نیگار لە سەردەمی ئیسلامدا ڕوودەکاتە خەت و زەغرەفەکاری و ڕازاندنەود و ئەبستراکت. ئەمە جگەلەوەی بابەتی وێنە و نیگارەکان دەبنە بابەتی دینی.

بەشێوەیەکی گشتیش، نیگار لە سەردەمی ئیسلام بەملاوە دەکەوێتە ژێر فەرمان و

فەرمانڕەوایەتیی خەلیفە و دەسەلاتدارەکان. ئەوەتا دەبینین هەرچی مزگەوت و میعمار و کۆشک و تەلار و قوتابخانە هەن بە ناوی ئەوانەوە ناو دەنرێن. هونەر لە میللەت و ژیان دوور دەکەوێتەوە. ئیتر ئەمە دەبێتە نەریتێک و سیاسیەکانی سەدەی بیستەمیش بە هونەرمەندان فێردەبن کە هونەرەکەیان بخەنە ژێر «ئەمر و ئیعازی» خۆیانەوە.

هەر چۆنێک بێت، لە ٦٣٢ بەملاوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەم، هونەری نیگاری کورد، لەلایەک لەژێر کولتووری ئیسلامدا، لەلایەکی دیکەشەوە لەژێر کاریگەرێتیی کولتووری میناتۆردا دەمێنێتەوە.

هونەری کورد، وەک چۆن پێشتر لەناو کولتووری ئیمپراتۆریەتەکانی ئاشووری و هەخامەنشی و ساسانیدا توابۆوە، ئەم جارەشیان دیسان لەناو کولتووری ئیسلامیدا - بەتایبەتی عەرەب - دەتوێتەوە : هەرچی کار و هونەرێکی کورد دەیکات، لە پێناو ئالای پیرۆزی ئیسلام، بۆ عەرەب حساب دەکرێت و دەبێتە مولکی ئەمەوی و عەبباسی و ئەییووبیەکان و ئەوانی تر.

کورد لە سەردەمی ئەمەوی (٦٦١ - ٦٧٠) و عەبباسیەکاندا (٧٥٠ - ١٢٥٨) سەدان کۆشک و تەلار و بینا و مزگەوت و منارە و ئاسەواری جوان لە ناوەوە و لە دەرەوەی کوردستاندا (لە میسر و دیمەشق و بەغداد حمص و عفرین و حلب) دروست دەکەن. نیگارکێشە کوردەکان سەدان میناتۆری جوان جوان دروست دەکەن و دەبنە سامانی عەرەب. جوانترین ئەو کۆشکانە لەوانەیە (حصن الاکراد) بێت کە حکومەتی بەعسی سووریا ناوەکەی بە (قلعه الحصن) گۆڕیوە!

عبدالرقیب یوسف لە توێژینەوەیەکدا کە لە ژمارە (١١٥) و (١١٧)ی سالی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ی گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا بلاوبۆتەوە، لەم بارەیەوە دەلێ:

دوو نیگارکێشی کورد، یەکەمیان بە ناوی (میهران کوڕی مەنصووری کوڕی میهران) و دووەمیشیان زانای فیزیایی و ئەندازیاری میکانیکی بە ناوی (بدیع الزمان کوڕی ئیسماعیلی جزیری) کە بە (ابن الرزاز الجزری) ناسراوە، لە سەدەی دوازدەی زاین واتە لە سالانی ١١٠٠ لە ناوچەی دیاربەکر ژیاون، بەرهەمی شێوەکاریان زۆر هەبووە و مامۆستای میناتۆر بوونە لە کوردستاندا. (ابن الرزاز نێزیکەی دوو سالێک لە سەدەی حەوتەمیشدا ژیاوە). ئەمە جگە لە وێنەکانی نێو کتێبی ستێرناسیی (صوره الکواکب الثمانیه والاربعین)ی (ابو الحسن عبدالرحمن بن عمر الصوفی الرازی) کە لە شاری (ماردین) کێشراون؛ لەگەل وێنەکانی (انجیل طفوله یسوع) کە لە (فلۆرەنسە)یە و لە سەدەی سیازدەیەمدا پزیشکێکی خەلکی ماردین کێشاونی.

عبدالرقیب یوسف لە (ل٢٠١-١٠٣)ی کتێبی (بانگەوازێک...)دا باسی ئەم دوو هونەرمەندە ناوبراوەی سەرەوەی (میهران و ابن الرزاز)ی کردووە و ئاماژەی بۆ محەممەدی کوڕی یوسفی کوڕی عوسمانی حەسەنکێفی (حصکفی) کردووە کە وێنەکانی دانەی دەستنووسی (طوپ قاپی)ی ئمرە (٣٤٧٢)ی کتێبی(الجامع بین العلم والعمل فی صناعه الحیل)ی (ابن الرزاز الجزری)ی کێشاون. ئەمەیش وێنەیەکی ئەوە کە مێژوونووسانی هونەری ئیسلامی هەمان

کات بە هونەری (ابن الرزاز)ی لەقەڵەم دەدەن، چونکە محەممەدی کوڕی یووسف تەواو لاسایی وێنەکانی ئەوی کردووەتەوە و قوتابیی ئەویشە. هەروەها ئاماژەی بۆ (مظفر)ی کوڕی حسێنی حەسەنکێفی کردووە کە مۆسیقاژەن و هونەرمەندێکی نیگارکێش بووە.

مێژوونووسانی هونەری ئیسلامی دەڵێن: لە باکووری موسڵ -واتە کوردستان- لە سەدەکانی ناوەڕاستدا قوتابخانەیەکی هونەری هەبوە. وێنەکانی میهران و ابن الرزاز و هونەرمەندانی دیکەی ئەو ناوچەیەی کوردستان ڕوخسار و بنەمای هونەرێکی تایبەتیان تێدا دەدۆزرێنەوە و هەمان کات کاری هونەری هێلێنستیی بێزەنتی‌یان پێوە دیارە. دکتۆر حسن الباشا بە شێوازی دیاربەکر (اسلوب دیاربکر) ناودێری کردوون.

عبدالرقیب یووسف لە (بانگەوازێک... ، ل١١٥)دا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە زۆر ڕەگەزی هونەریی قوتابخانەی وێنەکێشی دیاربەکر (مدرسە دیاربکر للتصویر) لەلایەن قوتابخانەی وێنەکێشیی بەغدا (مدرسە بغداد للتصویر)ەوە وەرگیراون. بگرە کارە هونەرییەکانی میهران و (ابن الرزاز)یش کراونە بناخەی ئەم قوتابخانەیەی دوایی‌یان، لەکاتێکدا سەرلەبەر مۆرکی قوتابخانەیەکی هونەریی سەربەخۆو تایبەت بە کوردیان هەیە و ڕەوا نیە چیدی لەنێو قوتابخانەی وێنەکێشیی بەغدادا بتوێندرێتەوە و شوێنەون بکرێت.

جا لەبەر ئەوە کە قوتابخانەی وێنەکێشیی بەغدا لەسەر بنچینەی هونەری هەرێمی (الجزیرة) دامەزراوە کە لە دیاربەکرەوە تا موسڵ دەگرێتەوە و بەپلەی یەکەم هونەری میهران و ابن الرزازی کردووەتە بنەمای خۆی، هێندێک کەس بەم قوتابخانەیەیان گوتووە قوتابخانەی وێنەکێشیی جزیرە (مدرسە الجزیرە للتصویر)و بەناوی بەغداوە ناویان نەناوە، وەک دکتۆر زەکی محەممەد حەسەن لە گۆڤاری (سۆمەر، بەرگی ١١، بەشی ١)دا گوتوویە.

هەروەها وێنەکانی دانەی دەستنووسی (معرفتنامە)ی ئیبراهیم حەقی ئەرزرۆمی پێویستیی بە لێکۆڵینەوە هەیە و یەکێکە لە کتێبە دەستنووسە وێنەکراوەکانی کوردستان. دانەی جامیعی بەکرئەفەندی لە موسڵ بریتی‌یە لە کۆمەڵە وێنەیەکی وەک وێنەی جیهانی لاهووت و عەرش و کورسی و جیهانی ئەرواح و بەهەشت و دۆزەخ و خۆرگیران و مانگ گیران و هیی دیکە.

هونەری ئیسلامی، بە بۆچوونی ژۆرژ مارسێ، بە درێژایی سەدەکانی رابردوودا، لە خزمەت و بەرژەوەندی خەلیفە و والی و دەسەڵاتدارەکان بووە : بۆیە دەبینین بینا و مزگەوت و تەلار و قوتابخانە و کتێبەکان بەناوی ئەوان ناونراون. هونەرمەندەکان بەپێی ئاستی چێژ و ڕۆشنبیری ئەوان کاریان کردووە.

لەلایەکی دیکەشەوە، چونکە دەیان نەتەوە و نەژادی جۆراوجۆر لە چین و هندستانەوە تاکو ئیسپانیا بەشدارییان لەم کردووە، بۆتە خاوەن چەندین خاسیەت و ڕێباز و سیما و ڕەوشی جۆراوجۆر : ئەمەوی، عەبباسی، مەغریبی، میسری، هندی، سووری، تورکی، بێزەنتی، ئێرانی، ئەورووپی. لەپاڵ ئەمانەشدا کاریگەریتی شارستانیەتەکانی دراوسێ: ئێرانی، ڕۆمانی، یۆنانی...

بەدرێژایی سەدەکان کەم نەبووە بەسەر هونەری ئیسلامدا، بۆ نموونە مزگەوتە ئەمەویەکەی (الولید بن عبد الملک) لە دمشق، پێشتر کەنیسەی یوحنا بووە و کراوەتە مزگەوت.

هەر بۆیەش هەندێ لە مێژوونووسەکان وای دەبینن کە هونەری ئیسلام لەسەر بنچینەی لاسایی کردنەوە و وەرگرتن لە میللەتانی دیکەوە دروست بووە و گەشەی سەندووە.

هەرچۆنێک بێت هونەری ئیسلام لەژێر کاریگەریێتی راستەوخۆی باوەڕی ئیسلامەتیەوە لەدایک بووە. قورئان و دینی ئیسلام، بە فەرموودەکانی پێغەمبەریشەوە، بوونەتە سەرچاوەی یەکەمی نەشونمای هونەری ئیسلام : دوورکەوتنەوە لە رابواردن و دانانی «باشە» لە جێگەی «خراپە» هەروەها وێنە نەکێشانی ژیانلەبەران و خۆ بەدوور راگرتن لە بەرجەستەکردن (تجسیم)، لەجیاتی ئەمە دەربڕینی ویژدانی و لایەنە رۆحانیەکان : لە ئەنجامی ئەمەشدا زەغرەفە بە توخمەکانی رووەک و گیانلەبەر و ئەندازیاری (کە ئەم زەخرەفانە ماددەی جەستەیان هەڵدەمژی و دابەشیان دەکردە سەر چەندین بەشی وردی زەخرەفەکاری، هەروەها جەستەکەیان خەت و خۆشنووسی بەشێوەیەکی فراوان و دیار پەرەی سەند.

زاراوەی (ئەرەبیسک) دەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرە هونەرە زەخرەفەکارییەی کە مرۆڤ و گیانلەبەری تێدا نابینرێت.

مێژوونووسی عەرەب، ابوصالح الالفی دەڵێ : ( وێنە کێشان لای ئێرانی و هیندی و عوسمانیەکان، لە سەدە رابردووەکانی ئیسلامدا لەگەڵ دینی ئیسلام دژ و ناکۆک نایەتەوە، ئەگەر وێنەی مرۆڤ و گیانلەبەریشیان کێشابێت ئەوا بەشێوازێکی تایبەتی ئەوتۆ بووە کە لەگەڵ ئیسلامەتی بگونجێت ). لە هەمان کاتدا، ناوبراو، زۆربەی قوتابخانەکانی هونەری منیاتۆر لە رۆژهەڵات بە هونەرێکی ئیسلامی لە قەڵەم دەدات : قوتابخانەی بەغدایی و مەغۆلی و تەیموری و سەفەوی و هیندی..

دینی ئیسلام، سەبارەت بە قەدەغەکردنی بت و بتپەرستی، پەیکەر و پەیکەرتاشی و نیگار و هەڵکۆڵینیشی قەدەغە کرد، دەنا ـ ئەگەر وانەبووایە ـ پەیکەرتاشی و شێوەکاریی کورد لەوانە بوو خۆی بدا لە قەرەی هونەری شێوەکاری و پەیکەرتاشیی ئەورووپا.

لە سەدەی حەوتەم بەولاوە، کاتێ دینی ئیسلام لە کوردستاندا رەگوریشەی خۆی داکوتا، وردە وردە گەلی کوردیش، سەبارەت بە قەدەغەبوونی پەیکەر و نیگار، لە پەیکەرتاشی و وێنەکێشان دوور کەوتەوە.

ئەم قۆناغەی سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستاندا تا سەدەکانی ناوەڕاست، بەوە دەناسرێتەوە کە کورد لە پەیکەر و پەیکەرتاشی دوور دەکەوێتەوە، زیاتر خەت و خۆشنووسی و نەخشاندنی مافوور و نیگاری سەر دیوار و تاق و پەنجەرە و دەستنووسەکانی بۆ دەمێنێتەوە. ئارشیتێکتووری جۆراوجۆری ئیسلامی و پاشانیش هونەری میناتۆر وردە وردە سەرهەڵدەدەن و پەرە دەستێنن. بەم شێوەیە هونەری نیگارکێشانی نەتەوەییمان دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتیی

عەرەبەکان و میللەتانی موسڵمانی دیکەی دراوسێ.

لەو سەردەمەشدا، دیسان، هونەرمەندەکانمان بریتین لە نەققارو بەردتاش و دارتاش و ئاسنگەرەکان.نەخش و نیگاری سەر مزگەوتەکان، کۆشک و تەلار و خانوو و بەرە و تاق و پەنجەرەکان، پرد و قەنتەرەکان، هەروەها نەخشی سەر جلوبەرگ و کەلوپەلەکانی ناوماڵ ( سندووق و قاسە و لانک ). چەک و جلوبەرگی شەڕ و ئامرازەکانی شەڕ، پۆشینی گیانلەبەران، زین، فەرش، دەستووسەکان. ئەمانە هەموو، بە بناغەیەکی گرنگی کولتووری نیگاری نەتەوەییمان دەژمێردرێن.

هونەری نیگارکێشانی فۆلکلۆریی کوردی، لەو سەردەمەدا، خاسیەتە نەتەوەییەکانی خۆی، لە ڕێگەی کەلەپوورە میللییەکەیەوە، باش پاراستووە: بەرگەبالیف، بەرگە تاق، سەکەڵەی ولاغ، تاسکلاو، چارۆگە، سوخمەی قۆڵدار، شەدە، سەرپەردە، دامێنی کەوای ژن، نەخشی سەر خەنجەر، چنینی فەقیانەی ژنان، بەرگ رادیۆ، قەنەویچە، سەرزین، سەرسەڵتە، گولنگی جامانە، هەوری، نەخشی سەر دۆلاب و سندووق، چوارچێوەی ئاوێنە و رەسم، نەخشی سەر بەڕە و مافوور، کوولەی چارپایە، سەرگۆزەوێ... سەدان نەخش و نیگاری فۆلکلۆریی دیکە: نیشانەی بایەخدانی تایبەتی گەلی کوردن بە ڕەنگ و هێڵ و نیگار و جوانیی شێوە و شێوەکاری، کە خەسڵەت و سیمای نەتەوەیی کوردییان تا ئەمڕۆش پێوە دیارە.

مەلای مەزبوورە
میناتۆرێکی عوسمانلی لە شاری مەرعش دۆزراوەتەوە
دیار نیە کێ وێنەی کێشاوە

# سەردەمی ئیسلام

## ژیانی سیاسی

۶۳۲- ۶۶۱ زایینی

لە ماوەی سەردەمی چوار خەلیفەکەی ئیسلامدا، واتە لە ماوەی سی سالێکدا، دووای هێرش و بەرەنگاری و شەڕ و شۆڕێکی زۆر، بەشێکی فراوان لە خەڵکی کوردستان (کە زۆربەیان زەردەشتی و مەسیحی، بەشێکیشیان جوولەکە و هەندێکیش مانایی بوون) شەهادە دەهێنن و دەبن بە موسڵمان.

۶۶۱ - ۷۵۰

خەلافەتی موسڵمانی ئەمەوییەکان دەسەڵات بەسەر سووریا و وڵاتی عیراق و ئێرانی ئەمڕۆدا دەگرن.

۷۵۰ - ۱۲۵۸

خەلافەتی عەبباسیەکان، پایتەختیان بەغدا، دەسەڵات لە ئەمەوییەکان وەردەگرن: کوردستان و بەشێکی فراوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

۹۲۹ - ۱۲۵۰

لە کوردستان چەندین میرنشینی کوردی حوکمی سەربەخۆیان هەیە: - حەمدانیەکان (۹۲۹ - ۱۰۰۴) لە جەزیرە؛ شەدادیەکان (۹۵۱ - ۱۱۷۴) لە گەنجەی ڕۆژئاوای باکووری کوردستان: مەروەندییەکان (۹۹۰ - ۱۰۹۶) لە دیار بەکر: میرنشینی ئەیوبیەکان (۱۱۶۹ - ۱۲۵۰) لە میسر و شام.

۹۹۵

تورکە سەلجوقیەکان ڕۆژهەڵاتی ئێران دەگرن، ئنجا لە ۱۰۲۹ مەراغە، لە ۱۰۵۶ مووسڵ، لە ۱۰۷۷ ئەنادۆڵ دەگرن.

۱۰۴۰ - ۱۲۲۰

لە ئێران سامانیەکان، ئنجا غەزنەوییەکان دەسەڵات دەگرنە دەست.

## ژیانی ڕۆشنبیری

۷۰۶ -۷۴۳ زایینی

ژیان و چەلاکیەکانی چەند مۆسیقاژێنێکی کورد: ابراهیم الموصلی و زەریاب و اسحاق ابراهیم الموصلی.

۸۷۷- ۹۲۹

ئەستێرەناسی کورد: ابو عبدالله محمد چارمونجەی مەراتی

۸۷۸ -۹۶۲

نیگارکێشی کوردی خەڵکی سندی: ابوبکر محمد کوڕی داود

۹۳۵ - ۱۰۱۰

ژیان و بەرهەمەکانی شاعیری کورد بابا تاهیری هەمەدانی لەهجەی لوری.

۹۷۷

ابن حوقل لە کتێبی (صورە الارض)دا دەستنیشانی شوێنی جوگرافیی کورد دەکات: (مشاتی الاکراد و مصایفهم)، بۆ یەکەم جار ناوی (الاکراد) لەناو کتێبی زانا موسڵمانەکان دەردەکەوێت.

۱۰۰۰- ۱۱۰۰

- شاعیری کورد: عەلی تەرەماخی
- دوو نیگارکێشی ناودار و مامۆستای میناتۆر لە مەڵبەندی جەزیرە و دیاربەکر: مهران منصور کوڕی مهران: بدیع الزمان اسماعیل (ابن الرزاز).
- لە ۱۰۷۶ محمود الکاشغری لە کتێبی (دیوان لغات التحرک) دەستنیشانی وڵاتی کورد (ارض الاکراد) دەکات لەسەر نەخشەی جیهاندا.

۱۰۷۳- ۱۱۶۳

شێخ نادی مەزهەبی یەزیدی لە کوردستاندا بڵاودەکاتەوە. گومەز و پەرستگاو مزگەوتەکان و لالش پڕدەکات لە نەخش و ڕۆلیێفی پەیکەرتاشی.

١١٥٠
سولتان سنجاری سەلجوقی ( ئوستانی کوردستان ) ئیقلیمی جیبال بۆ کوردەکان جیا دەکاتەوە و پایتەختیان دەکاتە شاری (بەهار).

١٢٠٦ : جەنگیزخان (تورک و مەنگۆل) ولاتی ئێران داگیر دەکەن.

١٢٥٨ / ٢ / ٢٠
هۆلاکۆی نەوەی جەنگیزخانی مەنگۆل بەغدا دەڕووخێنن و کۆتایی بە عەبباسیەکان دێنن .

١٢٩٧ : پایتەختی ئوستانی کوردستان لە بەهارەوە دەچێتە سولتان ئاباد

١٣٢٦ - ١٣٠٠
بنیادنانی دەولەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ

١٣٦٠ - ١٤٠٢ : تەیموورلەنگ و تەیمووریەکان

١٥٠٢ - ١٧٢٢ : شا ئیسماعیل: ئیمپراتۆریەتی صەفەوی لە ئێران.

١٥١٤ : شەڕی چالدێران لە نێوان صەفەوی و عشمانیەکاندا و دابەشکردنی کوردستان لەناو خۆیاندا .
١٦٥٠ - ١٨٥٠ : میرنشینی بابان

١٧٣٦ - ١٧٤٧ : نادرشا لە ئێران
١٧٤٧ - ١٧٧ : کەریم خانی زەند، پایتەخت : شیراز

١٧٧٩ : دەولەتی بنەماڵەی قاجاریەکان لە ئێران.

١٨٢١-١٨٤٧ : میرنشینی بەدرخان پاشا
١٨٥٣-١٨٥٥ : ڕاپەڕینی یەزدان شێر دژ بە خەلافەتی عوسمانی لەپێناو سەربەخۆیی کوردستان
١٨٨٠ - ١٨٨٢ ڕاپەڕینی شێخ عبیداللەی نەهری دژ بە خەلافەتی عوسمانی لەپێناو سەربەخۆیی کوردستان.

١١٦٩
لە دایکبوونی ا بن المستوفی .

١١٨٧
کۆنترین میناتۆری کوردی کە تا ئێستا دەسمان کەوتبێت کە بریتیە لە فرمانێکی صلاح الدین الایوبی و تێدا ئازادی و ئاسایشی ئەرمەنیەکان مسۆگەر دەکات لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆیدا.

١١٩٧ - ١٨٦٤ : میرنشینی ئەردەلان

١٣٥٦ - ١٤٢١
مەلا پەرێشان

١٥٣٠ - ١٦٠٠ : عەلی هەریری

١٥٦٧ - ١٦٤٠ : مەلای جزیری

١٥٩٥ : شەرەفخانی بەتلیسی: شەرەفنامە و بیست میناتۆرەکەی .

١٦٠٠ - ١٧٠٠ : ژیانێکی کولتووری لە کوردستانی ئێران لە ناوچەی ئەردەلان: بێسارانی و خانای قوبادی.

١٦٥٠ - ١٧٠٧ : ئەحمەدی خانی

١٦٥٤-١٦٥٥ : سووتاندن و تالانکردنی تابلۆ و بەرهەمە هونەری و ئەدەبیەکانی عەبدال خانی کوڕی ضیائوددینی کوڕی شەرەفخان لەلایەن مەلیک ئەحمەد پاشای درندەی والیی (وان).

١٧٧٩ - ١٨٢٧ : مەولانا خالیدی نەقشبەندی
١٨١١ - ١٨٩٧ : شاعیری ناسیونالیزمی کورد، حاجی قادری کۆیی

# هونەری میناتۆر

بەهزاد: جەنگی ئەڕیەلا لەنێوان ئەسکەندەری مەقدۆنی و
داریووش پاشای هەخامەنشی ٣٣١ پ. ز.    لە ١٥٢٥ دروستکراوە

وشەی میناتۆر بە بنچینە ئیتالیە، واتە نامەیەکی سوور بە وێنەیەکی بچوکەوە چەسپابێتە سەر دەستووسێک، یان وێنەیەکی زۆر بچکۆلەی وردبێ کە ڕووداوی ناو دەستنووسێک ڕوون بکاتەوە. ڕۆنانی « En miniature » واتە «بە بچووکراوەیی».

میناتۆر ئەو نیگارانە دەگرێتەوە کە سەرتاپای لاپەڕەیەکی ئەو کتێبانەیان پڕکردۆتەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە (٤٧٦ - ١٤٥٣ ) دەردەکەون، ئەمەش لە پاڵ نووسراوە ئەخشێنراوەکاندا. مێژوونووسانی عەرەب بەم جۆرە وێنانە دەڵێن (منمنمات)، هەندێ جاریش وشەی (شکل) و (لوحە -لوح) بۆ هەر کۆمەڵە وێنەیەکی تایبەت بەکاردێنن.

ڕیشەی ئەم هونەرە دەگەڕێتەوە بۆ میسری کۆن، یان یۆنان، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆتریش بۆ بیزەنتیەکان. میناتۆر لەوێ، لە سەردەمی ڕۆسانۆ بە سەردەمێکی زێڕیندا تێدەپەڕی. لە سەدەکانی ٩ - ١٢ شدا سوودی لە شێوەکاریی ڕۆمانی وەردەگرت، پاشان، سەبارەت بەو پەیوەندییە کەنیسەیی و دینیە جۆراوجۆرانەی لە نێوان وڵاتانی ئەوروپادا هەبوو، جۆرە یەکگرتنێک لە شێوازدا لە وڵاتەکانی ئەڵمانیا و ئینگلستان و ئیتالیا و نۆرماندی ( لە

سەردەمی سوارچاکیدا ) هاتە ئارا. ئەمەش لەسەر بەرگ و لە ناوەوەی لاپەڕەکاندا، بەتایبەتیش لەناو ئینجیلەکاندا. لە ئاکامیشدا بووە هۆی وێنەکێشانی ئاژەڵ و گیانەوەر و فیگەری سەمەرە و چەند توخمێکی فەنتازی. لە سەرەتای قۆناغی گۆتیکەوە (سەدەی ١٢) میناتۆر لە فەرەنسا پێشکەوتنێکی گەورەی بە خۆیەوە بینی کە تاکو سەرهەڵدانی چاپخانە (ناوەڕاستی سالانی ١٤٠٠) ڕانەوەستا. لە سەدەکانی ١٢ - ١٤ بەکارهێنانی میناتۆر لە چوارچێوەی دین و ئینجیل دەرچووبوو، بەرهەمهێنانی بەستراوەوە بە ژیانی شارستانی و پێشکەوتنی خەڵکەوە. پاریس لە سەدەی ١٣مدا ببووە مەڵبەندێکی دروستکردنی میناتۆر.

زێرکەفت کردن و چوارچێوەی ئەرشیتکتوری، لە سەدەی ١٤مدا، جێگەی ڕەنگ و دیمەنە سروشتیەکانی گرتەوە. چەندین میناتۆرکاری گەورە لە فەرەنسا ناوبانگیان دەرکرد. لە ئیتالیاش : سیمۆن، مارتینی، تادیۆ کریڤیللی لە سەدەی ١٥مدا. ئیدی، لەگەڵ ئەشونمای چاپخانە لە ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی ١٥مدا، میناتۆر چیدیکە لەناو دەستنووسەکاندا بەکارنەهات، بەڵکو وەک هونەرێکی سەربەخۆ، لەشێوەی تابلۆ و پۆرترێت دا پەرەی پێ درا و لە شێوەکاریی هاوچەرخ نزیک بۆوە.

بەڵام لە ڕۆژهەلات، سەبارەت بەوەی کە چاپخانە درەنگ دەگاتە وڵاتانی ئیسلام، دەبینین هونەری میناتور و ڕازاندنەوەی دەستنووسی و کتێب بە هونەرەکانی میناتۆر تا سەدەی ١٩ م هەر بەردەوامە. ئەمەش بۆ ڕوونکردنەوەی بیر و بۆچوون و حەکایەت و بەسەرهاتەکانی لەناو دەستنووس و کتێبەکاندا باسکراون.

بەم شێوەیە، میناتۆر، لە ئەوروپاش و لە ڕۆژهەلاتیشدا، لە پێناو ڕوونکردنەوەی ناوەرۆکی دەستنووس و کتێبەکاندا هاتۆتە ئارا و پەرەی سەندووە ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ کە هونەری شێوەکاری لە قۆناغی میناتۆردا جارێ هێشتا هەرپەیوەندیدارە بە نووسین، تێگەیشتنی سەرەتایی مرۆڤی تازە شارستان و جیهانبینینی ساکاری مرۆڤ بەرجەستە دەکات. بە ڕای زۆربەی زانایانی مێژووی شێوەکاریی ڕۆژهەلات، نیگارکێشی ئێرانی، مانی (٢١٥-٢٧٤ ز) بە یەکێک لە یەکەمین نیگارکێشە میناتوریستە ناودارەکانی ڕۆژهەلات دەژمێردرێت. لەم بارەیەوە مێژوونووسی ئینگلیز، دوڤیلارۆ دەڵێ :

« ئێمە هیچ بەڵگەنامەیەکی نووسراومان نیە باسی تەکنیکی میناتۆرەکانی سەردەمی مانیەکان بکات. تەنیاهێندە دەزانین کە لە سەرەتادا تابلۆکە چەورکراوە، ڕەنگە بەکار هاتووەکانیشیان بریتی بوونە لە سووری تۆخ وزەرد، سەوز کەمتر بەکارهاتووە ». لەوانەیە هەر تابلۆکانی هەمان ئەم هونەرمەندەش بێت وای لە مێژوونووسە ئێرانیەکان کردووە کە وا تێبگەن «مێژووی سەرهەڵدانی میناتۆر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان ٢٢٦-٦٥١ ز ». شۆرەتی مانی و تابلۆکانی، لە کوردستاندا، هێندە لە بەرەودا بووە کە پشتاوپشت گەیشتۆتەوە ڕۆشنبیرانی سەدەی نۆزدەهەمی کوردستان. شاعیر کورد، کوردی، بەم شێوەیە باسی مانی دەکا :

**که مانی هاته سەر کێشانی ئەبرۆی تۆ لە پاش چاوت**
**لە مەستی دەستی وا لەغزی کە کەج هات خەتی پەرگاری**

یان صافی دەڵێ:

**کەسێ بەم عەصرە نەیدیوە بەشەر وەک تۆ بە شیرینی**
**تەحەییور ما لە تەصویرت ئەگەر نەققاشی ئەگەر مانی**

مانی، کە سەبارەت بە دینەکەی خۆی، بە هاندانی ڕێبەرە زەردەشتی و مەسیحییەکانەوە لەلایەن بەهرام پاشاوە ئیعدام کرا، نیگارکێشێکی کارامە بووە؛ خۆی کتێب و دەستنووسەکانی خۆی بە وێنە و نیگار دەڕازاندەوە.

بۆ یەکەم جار چەند ئارکیۆلۆگ و زانایەکی رووسی و ئەڵمان و ژاپۆنی و فەرەنسی، چەند نەخش و نیگارێکیان دۆزییەوە کە لەسەر دیواری گومبەزاندا یان لەناو کتێباندا (دەستنووس) ڕەسم کرابوون و مێژوویان دەگەڕایەوە بۆ سەدەی ٨ - ٩ ز. وێنەی ناو کتێبەکان زیاتر ئەوانی سەردەمی مانییەکانن، ڕێبەرە دینی و مۆسیقاژەنە دینییەکان پیشان دەدەن. دەم وچاوە مرۆڤایەتییەکان لەناو ئەو تابلۆیانەدا بەوە دەناسرێنەوە کە بە تەواوەتی خڕ و بازنەیین (مەنگۆلین)، کەپوو کورت. شێوازی تایبەتی جلوبەرگ و سەروقژداهێنانیان لە ئەوانی ناو میناتۆری سەلجووقییەکانی خۆراسان و تورکستان و ئەنادۆڵ نزیکە. مێژوونووسی تورک، ی. یەکتین، دەڵێ :

« بنەچەی تورکەکان، کە لە ساڵی٧٤٤ ز دا دەوڵەتێکیان بە ناوی نوویگوور دامەزراندووە، لە ساڵی ٦٧٢ دا چوونەتە سەر دینی مانی و بوونەتە مانناییی »، « کەواتە، لەوانەیە نیگار کێشەکان تورکی مانناییی بووبن». ئەم تورکە مانناییانەش، واتە نوویگوورەکان بە بۆچوونی ولفرام ئێبرهار کە مێژوونووس و مامۆستای مێژووی چینە لە زانکۆی کالیفۆرنیا، کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە بەسەر هونەری نیگارکێشانی چینی بە تایبەتی لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی چینی ی تانگ لە سەدەکانی ٧ - ٩ ز دا. بەم شێوەیە ی. یەکتین، کە هونەرناس و مێژوونووسێکی تورکە، سەرهەڵدانی میناتۆری ڕۆژهەڵاتی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو تورکانەی کە لە ساڵی ٦٧٢ دا چوونەتە سەر دینی مانناییی (نوویگوورەکان). بە بۆچوونی ئەو، هەر ئەوانیش پەرە بەم هونەرە دەدەن و بە ڕۆژهەڵاتدا بڵاوی دەکەنەوە، بەتایبەتیش لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی تورکە سەلجووقییەکان. ئەمەش مەرج نیە ڕاست بێت و گفتوگۆی لەسەرە.

تورکە سەلجووقییەکان لە ٩٩٥ دا ڕۆژهەڵاتی ئێران پاشانیش لە ١٠٢٩ مەراغە و کوردستانی ئێران، ئنجا لە ١٠٥٦ مووسڵ دوواتریش لە ١٠٧٧ ئەنادۆڵ دەگرن. ئیتر کاریگەریی کولتووریی خۆیان بڵاودەکەنەوە.

ناودارترین میناتۆرسازی ئێرانی، کەمالەددین، ناسراو بە بەهزاد (١٤٥٠ - ٥٣٥) لە سەردەمی کۆتایی دەسەڵاتدارێتی تەیموورییەکان و لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتی سەفەوییەکاندا، لە

ئێران، لە شاری هورات و تەوریزدا ژیاوە. شا ئیسماعیلی سەفەوی بەهزادی نیگارکێش لەگەڵ خۆیدا راپێچ دەکات بەرەو پایتەخت.

بەهزاد دامەزرێنی هونەری میناتور نییە لە ئێران، پێش ئەو (مانی) هاتووە بەردی بناغەی ئەم هونەرەی لە رۆژهەلاتدا (لە ئێران) دامەزراندووە.

لە سەردەمی سەلجووقییەکاندا، بەتایبەتی لە سەدەی (١٢ و ١٣)یەمدا، ئەم هونەرە نازدارە، بەتایبەتی لە (خوراسان و ئەنادۆل)دا و لەلای ئیلخانییەکان، بەتەواوەتی بووژایەوە. میناتورەکانی ناو دەستنووسی (مقامات الحریری) کە لە سالانی (١١٨٠ - ١٢٣٧)دا رەسم کراون و ئەمڕۆ لە کتێبخانەی نیشتیمانیی فەرەنسا لە پاریس پارێزراون، دەچنەوە سەر خاسیەتی میناتورەکانی سەردەمی سەلجوقی کە (یحی ابن محمود الواسطی) بە شێوازی (قوتابخانەی بەغدایی) رەسمی کردوون.

(کمال الدین بەهزاد) یەکەمین نیگارکێشی ئێرانی و موسلمانە کە تابلۆی سەربەخۆی (لە دەرەوەی دەستنووس و کتێبدا) رەسم کردبێت: چونکە پێش ئەو، نیگارکێشەکان هەمیشە میناتوریان تەنیا لەسەر لاپەڕەی کتێب و لەناو دەستنووسەکاندا رەسم دەکرد و تابلۆ تەنیا بۆ روونکردنەوەی ناوەڕۆکی کتێبەکان بوو؛ سەربەخۆ رەسم نەدەکرا. لە هەمان کاتدا، بەهزاد، لەگەڵ مامۆستاکەی خۆی (روح الله) ئەوەیان کردە نەریتێک کە لەمەودوا ئیمزای خۆیان لەسەر تابلۆ دابنێن: چونکە پێش ئەوان، زۆر بەدەگمەن نیگارکێش ئیمزای خۆی لەسەر تابلۆ بەجێ دەهێشت. ناوبراو یەکەمین نیگارکێشی ئێرانی و موسلمان بووە کە پۆرترێت (وێنەی شەخسیی) کێشاوە.

چەندین قوتابخانەی میناتورسازی هەن. لێرەدا بەبێ باسکردنی خاسیەتەکانی هەر یەکێکیان و بەراوردکردنیان، دیارترینیان ناو دەبەین:

**١- قوتابخانەی بەغدایی**

زانای موسلمان ابن ندیم (٩٣٦ - ٩٩٨) لە کتێبی (فهرست) دا دەڵێ :( لە سەردەمی خەلیفە المعطی دا ٩٤٦ - ٩٦٧، سێ صەد ٣٠٠ نیگارکێشی مانی لە شاری بەغدا کاریان کردووە و کاریگەرییان بەسەر ژیانی شێوەکاری بەغداوە هەبووە.

وا پێدەچێ هەر لەژێر ئەم کاریگەرییەشدا «قوتابخانەی بەغدایی» لە بەستێنی میناتورسازیدا درەنگتر سەری هەڵداوە. ئەو قوتابخانە بەغداییەی، کە بە رای دکتۆر زەکی محەمەد حەسەن لە گۆڤاری (سۆمەر، بەرگی ١١، بەشی١): لەسەر بنچینەی هونەری هەرێمی (الجزیرة)ی کوردستان دامەزراوە کە لە دیاربەکرەوە تا مووسڵ دەگرێتەوە و بەپلەی یەکەم هونەری دوو هونەرمەندی میناتورسازی کوردی کردۆتە بناغەی خۆی (میهران و ابن الرزازی).

میناتورەکانی ناو دەستنووسی (مقامات الحریری) کە لە سالانی (١١٨٠ - ١٢٣٧) واتە لە سەردەمی سەلجووقیدا (یحی ابن محمود الواسطی) رەسمی کردوون، هەندێ لە رەخنەگران دەیبەنەوە سەر (قوتابخانەی بەغدایی). هەروەها عبدالله بن الفضل لە ١٢٢٢ سێ میناتوری بۆ

(خواص العقاقير) كێشاوە.

**٢- قوتابخانەی مەنگۆلی**

مەغۆل لە ١٢٥٧ بەغدایان گرت. ئیتر پەیوەندییە کولتوورییەکانی ئیسلام و چین رووی لە گەشەسەندن کرد. بۆیەش کاریگەرێتیی کولتووری چین و خاسیەتەکانی نیگاری چینی بەسەر قوتابخانەی مەنگۆلیی میناتۆرسازی، لە سەدەکانی ١٣- ١٤م، ئاشکرا دیارە.

**٣- قوتابخانەی تەیووری**

تەیوورلەنگ کە لە ١٣٩٣ بەغدای گرت، ئیمپراتۆریەتەکەی تا ١٥٠٠ لەوێ مایەوە. ئەم ماوەیەش درەوشاوەترین قۆناغی میناتۆر بوو. سەید ئەحمەدی تەوریزی و عەلی میترگ نەقاش ناودارترین دوو میناتۆرسازی ئەم قوتابخانەیە بوون. هەر لەو سەردەمەشدا میناتۆرسازی داهێن، بەهزاد، کە شاگردی ئەوان بوو، لە شاری هورات پەیدا دەبێت.

**٤- قوتابخانەی سەفەوی**

هونەری میناتۆر لە سەردەمی سەفەوییەکاندا لەسەر دەستی بەهزادی نیگارکێش گەیشتە ئەوپەڕی پێشکەوتنی خۆی، بەتایبەتیش لەشاری تەوریز. ئەمەش چونکە دەیان نیگارکێش و قوتابیی رەسم لەلای ئەو فێری رەسم و میناتۆر بوون و لەگەڵ ئەو لە دەرباری شا و لە کتێبخانەی پاشایەتیی سەفەویدا کاریان دەکرد، لەوانە: سوڵتان محەممەد و مظفر عەلی و میرزا عەلی و سەید عەلی. لە ئەنجامدا، رێبازێکی تایبەتی میناتۆر هاتە ئارا بەناوی رێبازی سەفەوی لە هونەری میناتۆردا کە بەردەوامبوونی قوتابخانەی تەیووری بوو. ناودارترین میناتۆرسازی سەردەمی سەفەوی رضا عباس بوو کە لە کۆتایی سالانی ١٦٠٠ ژیاوە.

شایانی باسە، هونەری میناتۆر و نیگار لە کۆتایی سەردەمی سەفەوییەکان بەملاوە، وردە وردە دەخزێتە ژێر کاریگەرێتیی هونەری شێوەکاری رۆژئاواییەوە.

ئنجا هەندێک پێیان وایە کە سەلجوقیەکانیش قوتابخانەیەکی تایبەتیان هەیە و میناتۆرەکانی (کتاب سمک عیار) نووسراوی ابی قاسم شیرازی (کە ئێستا لە کتێبخانەی بۆدلیان لە ئۆکسفۆرد پارێزراوە) دەچنەوە سەر ئەم قوتابخانە هونەرییە. شهاب الدین یاقاش و عین الدولە کە بیست پۆرترێتی بۆ شیعرەکانی جلال الدین الرومی کێشاوە، ناودارترین میناتۆرسازدکانی سەلجوقین.

شێوەکاریی میناتۆرسازیی تورک لەگەڵ گرتنی ئەستەمبوڵ لە ١٤٥٣ دەست پێدەکات لەلایەن سوڵتان محمدی دووەم (فاتح) کە «نقاشخانەی رۆم» و «نقاشخانەی عەجەم» دادەمەزرێنێ بۆ هونەرمەندان کە هەندێکیانی لە تەورێزەوە هێنابوو بۆ کارکردن. ئنجا دواتر سوڵتان سەلیمی یەکەم چەندین نیگارکێشی دیکەی لە تەورێزەوە هێنا: شێخ کمال، شاه محمد، علی بگ، میرزا بگ، میر اغا. مێژوونووسە رۆژئاواییەکان ئەمانە بە فارس لە قەڵەم دەدەن، بۆیە بەڕاستیش پێویستە میناتۆری ئەو سەردەمانەی عوسمانی بە ئێرانی بژمێردرێت؛ چونکە هەموویان ئێرانی

بوون. میناتۆری عوسمانی لە سەدەی ١٥مدا دوو بەرهەمی سەرەکیی تێدایە. یەکەم: جراحیەی ایلخانی یە، نووسراوی شرف الدین صابونچي اوغلو، نیگارکێش دیار نیە کێیە. (٢٠٥) لاپەڕەیە و (١٤٠) میناتۆری تێدایە لە ١٤٦٦ پێشکەشی سوڵتان محمد فاتحی کردووە. دووەمیشیان: پۆرتریتی سوڵتانی ناوبراوە گوڵێکی سووری بەدەستەوەیە، سنان بەگی میناتۆرساز دروستی کردووە.

لە سەدەی ١٦م بەملاوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی سوڵتان موڕادی سێیەمدا ١٥٧٤-١٥٩٥ میناتۆری عوسمانی دەگاتە چڵەپۆپە و چەندین شاکار بەرهەم دێنێ؛ بەتایبەتیش لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی سوڵتان سولەیمانە قۆز بەملاوە. زبدە التواریخ و هنرنامە و سلسلەنامە و عجائب المخلوقات لەم سەدەیەدا ڕازێندراونەتەوە بە میناتۆر. نقاش باشی یەکان عادەتەن لەناو دەرباری سوڵتان پارەی چاکیان دەدرایە.

لە سەدەی ١٦مدا سێ نیگارکێش شۆرەت پەیدا دەکەن: ناصح المطرقي کە ٣٢ میناتۆری بۆ سلیماننامە و دە میناتۆریشی بۆ تاریخی سوڵتان بایەزیدی دووەم کردووە، بۆ منزلنامەیش لە ١٥٣٧ میناتۆری دروست کردووە. چەندین میناتۆری شارەکانی کوردستانیشی وێنەکێشاوە. هەروەها رئیس حیدر نگاری (١٤٩٢ ، ١٥٧٢) کە میناتۆری بۆ زۆربەی سوڵتانەکان کێشاوە. ئنجا نقاش عثمان کە ئەویش پۆرتریتی بۆ زۆربەی سوڵتانەکان کێشاوە.

لە بەراوردی میناتۆری ئێرانی و تورکیدا دەڵێن: ئێرانی حەزیان لە بابەتی ڕۆمانسی و ڕووداوەکانی دین و دنیا بووە، بەڵام تورک زۆرتر حەزیان لە پۆرتریتی سوڵتانەکان و ژیانی دەربار و جەنگەکانیان و ڕاوەکانیان بووە. ئێرانی لیریکە، تورک جیددی و ئۆفیسیال بووە.

لە سەدەی ١٧مدا میناتۆری عوسمانی جۆراوجۆریتی تێدەکەوێ، بەڵام لە سەدەی ١٨مدا پێشکەوتنێکی دیار ڕوودەدا: عبدالجلیل لەونی پەیدا دەبێت و کاریگەریتیی ڕۆژئاوا بۆ ناو میناتۆری عوسمانی دەگوازێتەوە. هەر لەم سەدەیەدا سیماکانی نافرەت و ژنایەتی لەناو میناتۆردا ڕوونتر و زیاتر دەردەکەون، جگە لە ڕەنگدانەوەی واقیع و ژیان لەناو تابلۆکاندا.

شایانی باسە، زۆربەی میناتۆرەکانی عوسمانی ئیمزا و ناوی هونەرمەندەکەیان بەسەرەوە نەبووە. نایانناسینەوە. ئەلبوومی موڕەققا لە کتێبخانەی تۆپقاپیسەرای زیاتر لە دە هەزار میناتۆری بێ ئیمزا و بێ ناوی نقاشی تێدایە: کەس ناتوانێ بزانێ نقاش کێ و کێندەری بووە؟

ئێمە ئەگەر بەرهەمی هونەریی عەبدال خانی کوڕی ضیائوددینی کوڕی شەرەفخانی مێژوونووسمان دەست بکەوتایە، ئەوا گەنجینەیەکی دیکەی هونەری وێنەکێشیی کوردیمان زیندوو دەکردەوە. عەبدال خانی میری کورد بە وێنەکێشێکی کورد دەژمێردرێت، چونکە دەستێکی باڵای لەو هونەرەدا هەبووە.

ئەولیا چەلەبی کە ١٤ ڕۆژ بەمیوانی لای عەبدال خان ماوەتەوە و لەنێزیکەوە بەهرە و بەرهەمی دیون، دەڵێت:

عەبدال خان وێنەکێش و خۆشنووس (خطاط)و نەخشکار (نقاش)یشە. بێگومان (ئەولیا چەلەبی)ی دۆستی کورد وێنەو تابلۆ دەستکردەکانیی بینیون. بەداخەوە ئەو کارانە و (٧٦) کتێبی دانراوی عەبدال خان خۆی لەگەڵ (١٠٥) نامەی گرنگیدا ئێستا هەموو بزرن و، دوور نیە لەنێویش چووبن. ئەویش پاش ئەوەکە مەلیک ئەحمەد پاشای دڕندەی والیی (وان) سامان و گەنجینە و نامەخانەی عەبدال خانی لە ساڵی(١٦٥٤-١٦٥٥ی زاین)دا تالان کرد کە هەزاران کتێبی بایەخداری لەنێودا بوود.

ئەولیا چەلەبی، لە سیاحەتنامەکەیدا (و: سەعید ناکام، لە بڵاوکراوەکانی ک. ز. ک.، بەغدا: ١٩٧٩، ل ٢٧٨ــ ٣٠٠) لەبارەی بارودۆخی نیگارکێشان لە سەدەی ١٦ی کوردستاندا دەڵێ: سەروەری گەورەمان، جەنابی عەبدال خان پیاوێکی شاعیر و قسە رەوان و نووسەر و زانا، لە هەموو هونەرێکدا وەستایە. سامانی عەبدالخان کە هەراج کران: لە شەرەفنامە و شانامە و گولستانی شیرازییەوە بگرە تا دەگاتە حەفتا بەرگ تەفسیری قورئان. هەزار بەرگ دەسخەتی جۆراوجۆر. باری حەوت حوشتر کتێبی بایبدار. لەگەڵ حەفتا و شەش بەرگ کتێبی فارسی و عەرەبی و تورکی لە دانانی عەبداڵ خان، لەگەڵ سەد و پێنج نامیلکەی جوربەجۆر کە زۆربەیانی بە فارسی نووسیبوو. چەند نەخشەی رەنگاورەنگی دنیای کۆن و نوێ کە سەری تەماشاکەریان دەسووڕاند. دوو سەد دانە وێنە و نیگاری سەرسوورێنەر بە قەڵەمی عەجەم و فەرەنگ کێشراون. یەک لەوانە شەڕی نێوان دوو دەستە کەشتیی شەڕکەر بوو. هەروەها تابلۆی دەسکردی هونەرکارە بەناوبانگەکانی جیهانی وەکو شاقولی، وەلێ جان، شەمسی خان، مالیک، ئەرژەنگ، ئاغا رەزا، محەممەد رەزا، بەهزادیان تێدابوو کە چاوی تەماشاکەریان ئەبلەق دەکرد. ئەسپێک و فیلێکی جادوویی کێشرابوو کە بەراستی جادوویان کردبوو. وێنەی بێ هاوتای سەر قوماش لە دەسکردەکانی ئاغا جان و تەقیەدینی بەلخی یان لەناودا بوو، قەڵەمکاریی ریزوان بەگی میریش کە یەکەمی زەمانەیە. بەڵێ هەزاران بەرهەمی هونەرکارە بەرزەکانی دنیا لێرەدا خرابوونە هەڕاجەوە. ئەو کوردە هەمە ڕەنگە جروجانەوەرانە و ئەو خەڵکەی هێنی خۆی و گێژەر لێک ناکەنەوە، ئەم وێنانەیان دەستاودەست دەگێڕا و لەم خێوەتەوە دەیانبردە خێوەتێکی دیکە و بێ قەدەر ئەمدیوەودیویان دەکردن تا وای لێ دەهات بە شڕوڕاکاوی دەدرایەوە دەستی دەڵاڵەکە».

ئەم کڕین و فرۆشتنی شتومەکانە چوا رۆژی خایاندووە. هەزار کەس لە پیاوەکانی خانی تازە و سێ هەزار عەسکەر کرابوون بە پاسەوانی کڕین و فرۆشتنی ئەو شتومەکانە.

ئێمە کە ئەم دێرانەی ئەولیا چەلەبی دەخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە لە سەدەی ١٦مدا لە کوردستان، بایەخدانێکی بەرفراوان هەبووە بە نیگار و هونەری وێنەکێشان، بەتایبەتیش لە چوارچێوەی میرنشینی بەتلیسدا.

هەروەها لە ریزی ئەو نیگارکێشانەی کە چەلەبی ناویان دەهێنێ، لەوانەیە بەشێکی زۆریان کورد بووبن. ئەمەش بە بەلگەی ئەوەی، بۆ نموونە: پیرەمێرد لە شانۆنامەی مەم و زینەکەیدا،

چاپی دووەمی سلێمانی، ساڵی ١٩٦٨، لاپەرە ٤، باسی نیگارکێشێک دەکا بە ناوی ئەرژەنگ، کە وێنەکێشێکی دێرینی کورد بووە و لە سەدەی ١٦مدا وێنەی مەم و زین دەکێشێ. فەرهەنگی برهان قاطع، چاپ پیروز، طهران: ١٣٣٦، ص ٧٣ باسی کردووە. ئەم نیگارکێشە هەمان ئەو نیگارکێشەیە کە ئەولیا چەلەبی باسی کردووە لە لاپەرە ٢٨٤ی تەرجەمە کوردییەکەدا.

## میناتۆرەکانی شەرەفخانی بەتلیسی ١٥٩٥

٢٠ میناتۆر لەنێو دەستنووسەکەی کتێبی شەرەفنامەدا هەن کە میر شەرەفخانی بەتلیسی لە ساڵی ١٥٩٥دا وێنەی کێشاون بۆ ڕازاندنەوەی کتێبەکەی خۆی و دەربڕینی ڕووداوەکان بەشێوەیەکی هونەری.

ئۆرژیناڵەکانی ئەم تابلۆیانە لەژێر کۆدی (٣١٢) لە نامەخانەی (بودلیان)ی زانکۆی ئۆکسفۆرد لە لەندەن پارێزراون. قەوارەی تابلۆکان بەقەدەر قەوارەی لاپەرەکانی شەرەفنامەن کە (٢٩×١٦٫٥سم)ە. بۆ یەکەمین جار مامۆستای مێژوونووس عبدالرقیب یوسف ئەم تابلۆیانەی دۆزییەوە و پەیدای کردن و توێژینەوەی لەسەر ئەنجام دان و هەر خۆیشی لە (تابلۆکانی شەرەفنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر - ١٩٩٨) سەلماندوویەتی کە ئەم تابلۆیانە میر شەرەفخانی بەتلیسی خۆی دروستی کردوون.

هونەرمەند، شەرەفخانی کوڕی شەمسەدین خانی بەتلیسی لە ٢٥ی شوباتی ١٥٤٣ی زا دا لە (گەرمەروود)ی ناوچەی (قوم)ی ئێران لەدایک بووە. لە تەمەنی نۆ ساڵیدا چووەتە قوتابخانەی شاتەهماسبی کوڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی کە تایبەت بووە بە کوڕانی گەورە پیاوان. لەپاڵ ئەوەی میری بەتلیس بووە، نیگارکێش و مێژوونووسێکی کارامەش بووە. شەرەفخان نووسیویە ئەودەمەی لە قوتابخانەی شا بووە، شا تەهماسب کاتی سەردانیان گوتوویە جاروبار ناگاتان لە سنعاتی (نەقاشی) واتە هونەری وێنەکێشی بێ. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لەو سێ ساڵەدا دەرسی وێنەکێشی خوێندووە. شاتەهماسب خۆیشی نەقاش بووە و باوکی ناردوویە بۆ قوتابخانەی نەقاشی لە شاری هەرات تا لەلای گەورە نەقاشانی قوتابخانەی نەقاشیی تەیمووری فێری نەقاشی ببێ.

شەرەفخان لە کۆتایی یەکەم بەرگی شەرفنامەدا (ل٥٨٦ لەچاپی قاهیرە) ئاماژەیەکی زۆر بەهێزی هێناوەتەوە بۆ ئەوەی کە لە هونەری وێنەکێشیدا گەیشتووەتە پلەی هونەرمەندی گەورە (الواسطی) بەوەی قەڵەمەکەی خۆیی چواندووە بە قەڵەمی دەمتیژ و بە لەنجەولاری (الواسطی). شەرەفخان لە قوتابخانەی شادا فێری ڕێو شوێنی وێنەکێشی بووە.

## بایەخی تابلۆکان و ڕێبازی هونەریی وێنەکێشانی شەرەفخان

میناتۆرەکانی شەرەفنامە لە هەموو ڕوویەکی ئەتنۆگرافی و ئەدەبی و شێوەکاری و کۆمەڵناسی و دینی و ئێستاتیکا و مێژووییەوە بایەخی خۆیان هەیە. مامۆستای شارەزای ئەم بوارە، عبدالرقیب

یوسف له (تابلۆکـانی شـەرەفنامـە، بلاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیـری، چاپی دووەم، هەولێـر - ١٩٩٨) لەم بارەوە دەڵێ:

تابلۆکـان سـەرجەم بە شێوەیەکی هونەریی بەرز و بە دەستی هونەرمەندێکی بەدەسـەڵاتی کـورد وێنەکێشراون کە شەرەفخانە. بەڵگەنامەیەکی بەنرخن بۆ بەشێک لە ژیانی کۆمەڵایەتیی چوارسەد ساڵ لەمەوبەری کـوردسـتـان. لەم تابلۆیانەدا دەیان ئامێری مۆسیقایی و ئامرازی شـەڕ دەبینین. جگە لە کەلوپەلی نیـومـالیش. هەروا نەخشی بیناسـازی (الريازە المعمـاريە)ی وەک نەخشی ئەندازەیی و گیاییی سەر دەرگا و قەراغ و ڕووکاری خانوو لەگەڵ نەخشێکی (فوسەیفسـا).

تابلۆکانی شـەرەفنامە بایەخێکی پتریان بە جلو بەرگی کوردیی ئەوسـا داوە و جلی تورکیی عوسمانی و ئەورووپایی و فارسـیـشـیـان پیشان داوە. وێنەکێشی تابلۆکان (شـەرەفخان) جلوبەرگی کوردیی بە شێوەیەکی جیاواز لە هیی تورک و فارس و ئەورووپاییەکانیش وێنە کێشـاوە. تابلۆکان هەریەکـەو لەسـەر لاپەڕە یا پەڕەیەکی تایبـەتـو جیـاواز لە دەقی نووسـراوی کـتـێـبـەکە کراون، یەکێکیـان نەبێ کە کەمێک نووسینی لەگەڵدایەو خراوەتە نێو چوارچێوەیش. تابلۆکان خراونەتە نێو چوارچێوە، بەڵام جاری وا هەیە بەشێکی وێنەیەک لە چوارچێوەکە دەرچووە. خۆ بە چوارچێوەوە ئەبەستن خەسڵەتێکی قوتابخانەی تەیمووری بووە.

کەسانی نێو تابلۆ هەمیشە بە ڕوخسار و سەروسەکوت و جلوبەرگ و ڕێکوپێکییان و بە باری دەروونیو جۆری جووڵانەوەی ئەوکـاتەیاندا دەناسـرێنەوە، بۆ نموونە سـولـتـان سـەلیم لە تابلۆی (شـەڕی چالدێران)دا بەوە دەناسـرێتـەوە کە ئەسـپـەکەی زلەو گـولـنگە لەملیـدایە، چونکە هیچ ئەسـپێکی دیکەی بەردی عـوسـمـانی لەو تابلۆیەدا وا زل و گـولـنگە لەمل نەکراوە. هەروەها دوو کـەسـیش لە پێشـەوەیدان، هەریەکـەیـان (تەبەرزین)یان بەدەسـتـەوەیە، تەبەرزین لە شوێنی وادا نیشانەیەکی شایانەیە.

هێندێک تابلۆی شەرەفنامە پڕ لە وێنەن، چونکە بابەتەکە وای پێویست کردووە، وەک تابلۆی شـەڕی چالدێرانو شـەڕی ئەدرنە و شـەڕی بدلیـس. هونەرمەند یەک دوورایی (بعد)ی بۆ وێنەکان داناوەو ڕووتەختێ، واتە دووریو نێـزیکییانی وەک یەک وێنە کـردووەو قـوولـی (العـمق) - دوورایی سێیەم (البعد الثالث - المنظور)-ی پێ نەداونو بەدوو دوورایی درێژیو پانی وێنەی کێشـاون. بەواتایەکی دیکە، نەیکردووە وێنەی نێزیک گەورەو هیی دووریش بچووک بکێشێ. ئەمـە ڕێـبـازی زۆربەی هونەرمـەندانی زەمـانی ئیـسـلامی بووە، وەک (ابن الرزاز)ی جـزیریو (الواسطی - يحيى ملا محمود بن يحيى بن ابی الحسن بن كوريها الواسطی). قوتابخانەی هونەریی کاتی مەغۆل (ئیلخانی) کە لە سەرەتاکانی سـەدەی چواردەهەمدا پەیدا بوو، دوورایی سێیەمی تێدا بەکاردەهات، بەڵام قوتابخانەی هونەریی تەیمووری (کەمێکی سـەدەی چواردەهەم و سـەدەی پازدەهەم) دوورایی سێیەمی تێدا بەکار نەهاتووە.

وێنەکێشی شەرەفنامە پانتاییی درەخت و گیاکانی زۆر بەتەنکیو کاڵی ڕەنگاندووە و یەکجار

چرو پڕ نین. هەروەها وێنەکانی بەشێوەیەکی واقیعییانە کردوون، ئەگەرچی پەنجەرە گەورەکەی نێو تابلۆی پێنجەم کە لەبارەی شاری جزیرەوەیە رەمزی‌یەو نیشانەی خانوویەکی گەورەیە. هەروا درەختی نێو تابلۆکانیش گوڵدار بن یان بێ گوڵ واقیعی و ڕاست نین، بەڵکە لە سروشت لایانداوە (محورة عن الطبيعة). ئەم جۆرە درەختە ناسکە لە سروشت لادەرانە لە وێنەکانی قوتابخانەی مەغۆلی و تەیووری و سەفەویشدا هەن و هونەری عوسمانی وەریگرتووە. هونەرمەندان وێنەی ئەم درەختانەیان لەیەکدی وەرگرتووە. بەڵام درەختەکانی نێو تابلۆکانی (الواسطی)ش کە سالی ٦٣٦ی کۆچی(١٢٣٧)ی زا لە دەستنوسی (مقامات الحريری)دا کوودونی ئەم چەشنە درەختە نین و بەشی هەرە زۆریان گەورەن و هێندێکیان نەبێ -وەک دارخورما- ئەواتی دیکە هەموو لە سروشت لایانداوە.

هێندێک لە گیاکانی تابلۆکانی شەرەفنامە کە زۆربەیان گیا سوێسنەن واقیعین و لە تابلۆی پازدەهەمدا بە گوڵەکەیدا باش دەناسرێتەوە. گیاکانی دیکە زۆربەی زۆریان واقیعی نین و لە تەختی تابلۆکاندا ڕاخراون و وەک هیی قوتابخانەکانی دەوری ئیسلامەتی لە سروشت لایانداوە. شاخە بەردینەکان زۆر بە جوانی وێنە کێشراون و لەگەڵ ئەو درەختە ناسکانەدا کە لە بەردە وشکەکاندا سەوز بوون شێوەی نەخش (زەخرەفە) دەدەن. بەردەکانیش بە چەند ڕەنگێکی کراوەی ناسک رازێندراونەوەو هەر زۆر هاوجووتی شاخە بەردینەکانی کوردستانن.

عبدالرقيب يوسف لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا دەڵێ:

وێنەی دەموچاوی ژن خڕ و قەڵەو و چاوبادەمیی تەسک و لارن. ئەو دەموچاوانە لە ڕەگەزی تۆرانین و بەهۆی هونەری ئێرانی‌یەوە لە عێراق و میسر و وڵاتی شامدا بلاو بوونەتەوە». ئەوە لەزۆر وێنەی (الواسطی)شدا دەبینرێت. هەرچی وێنەکێشی شەرەفنامەیە چاوی بادەمیی تەسکی لارو دەموچاوی خڕی بۆ ئافرەتان بەکار نەهێناوە، بەڵکوو چاوی ئاسایی کوردیی وێنەکێشاوە. لەبەر ئەوە دەموچاوی ئافرەتەکان شێوەی مەغۆلی یا بڵێین ڕەگەزی تورکی وەرنەگرتووە. لە گەلێک جێگادا خاڵی لەسەر ڕوومەتی ژن داناوەو ملیشی باریک کردووە. ئەگەر ئەم دوو سیفەتە لە هێندێک شوێندا نەبووبایە ژن لە پیاو جوێ نەدەکرایەوە، چونکە زۆرجار سەروکڵاوی ژن لەهیی پیاو جوێ ناکرێتەوەو وەکوویەکن. هونەرمەند وێنەی ئافرەتی بەبێ خشڵ کێشاوەو تەنیا گوارەی بچووک نەبێ وەک ئەوەی لە گوێچکەی پیاوەکاندا دەبیندرێت و ئەمەیش ڕێبازی زۆربەی هونەرمەندانی سەدە ناوەنجیەکان بووەو وەک هیی کاتی مەغۆلی و سەفەوی‌و عوسمانی تا سەردەمی (شەرەفخان)یش هەبوو. وێنەی ژن بەخشڵەوە زۆر کەمە.

هونەرمەند پەنجەی دەستی مرۆڤی درێژو باریک وێنەکێشاون بەزیادەوە وێنەی زۆربەی لاوەکانی بێ ڕدێن‌و بێ سمێڵ‌و هیی زۆربەی بەساڵدا چووانیشی بەسمێڵەوە کێشاوەو بێ ڕدێن‌و ڕدێنداریشیان تێدایە، وەکوو زۆربەی میرانی کورد کە ڕدێن‌و سمێڵیان هەن. هێندێکیان ڕدێنیان تەنکو هەندێکیشیان پڕ، وەک ڕدێنە گەورەکەی ئەسەدەدینی هەکاری. هەیشیانە ڕدێنێکی

کەمی لەسەر چەناگەی هێشتووەتەوە، وەک ئەو ئەسپ سوارەی تابلۆی ژمارە (١٢) کە لەبارەی میرنشینی هەکاری‌یەوەیە. جۆرە ڕدێنێکی دیکەی هەیە وەک هیی پێشوو لەسەر چەناگەیەتی، بەڵام بە خەتێکی باریک تا لای گوێچکەی چووە. شایانی باسە لەکاتی (بەهزاد)ی مامۆستای گەورەی هونەری سەفەویدا - یانی لە سەردەمی شا ئیسماعیلدا- نەخشکردنی جلوبەرگ لە وێنەدا باو بووە. بەڵام لە سەردەمی شا تەهماسبدا ئەوە باو نەبووەو ئەگەر نەخشیش بکرابان بە خاڵ خاڵ بووە.

عبدالرقیب یوسف لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا، لەبارەی سوود وەرگرتنی شەرەفخان لە هێندێک سەرچاوەی هونەرییەوە، دەڵێ:

ئەگەرچی وێنەکانی شەرەفنامە دەچنەوە سەر قوتابخانەی هونەری سەفەویی یەکەم، بەڵام وێنەکێش سوودی لە تابلۆی یەکەمی دەستنووسی (منافع الحیوان) وەرگرتووە کە وێنەکانی سەر بە قوتابخانەی هونەریی ئێلخانی (مەغولی)ن، چونکە تەختی سوڵتان عوسمان لە تابلۆی ژمارە (١٧)دا لەسەر شێوەی تەختی سوڵتان (مەحموود غازان) (١٢٩٥-١٣٠٤ی زا)ی کوڕی ئەرغون کوڕی ئاباقای کوڕی هۆلاکۆ و شێوەی دانیشتنی هەردوو سوڵتانیشی وەک یەک وێنە کێشاوە. تەختی سوڵتان عوسمان سێ لای بە تەختە گیراونو لەپێشەوە کەمێک کراوەیەو یەکسەر لەسەر سەکۆیەک دانراوە. تەنانەت هەردوو تەختەی تەنیشتەکانی پێشەوەیان (١٠٠٪) وەکوو یەکن‌و، تەنیا جیاوازیی نێوانیان ئەوەیە هێنەکەی سوڵتان عوسمان بێ قاچەو تەختەیەکی مەیلەو باریک لە دەمەکەیدا دانراوە کە ڕەنگە پاش دانیشتنی سوڵتان ئەمجا خرابێتە بەردەمی. دانیشتنەکەیشی وەک هیی مەحموود غازانە، بەڵام ئەم دەستە چەپی بەلای سنگیەوە بەرز کردووەتەوەو مەحموود غازنیش دەستە ڕاستو دەستە چەپی وان لەسەر ڕانی. گومانم لەوە نی‌یە کە شەرەفخان ئەم وێنەیەی سوڵتان مەحموودی دیوە کەوا لە دەستنووسی (منافع الحیوان)ی (عبیدالله ابن بختیشوع)ی نۆشدار (طبیب)ی دەوڵەتی دۆستکیی کورددایە. دانەکەی نامەخانەی مۆرگان لە نیویۆرک‌و ئەم دانەیەیش لە نامەخانەی (شەرەفخان)دا بووە، چونکە لەنیوەی یەکەمی سەدەی پازدەهەمدا یا کەمێک پێشتر کەوتووەتە نێو نامەخانەی (شمس الدین بن ضیاء الروشکی)ی لە باپیرانی شەرەفخان کە لە میرە هەرە گەورەکانی بدلیس بووە و سکەی لێداوە. ئەم دەستەوشەیە لەنێو نەخشێکی جوانی سەر پشتی دەستنووسەکە هەیەو مۆری (شمس الدین)یشی لەسەرە کە نیمزایەکی بادەمی‌یەو ناوی (شمس الدین) بەشێوەی (طغراء) لە نیمزاکەدا نووسراوە. هەروەها هەمان نیمزای (شمس الدین) لەسەر دەستنووسی کتێبی (ابن الرزاز)دا هەیە کە دانەکەی وا لە نامەخانەی (طوپ قاپی)و نیشانەی ئەوەیە کە ئەمیش لە دەستنووسە وێنەکراوەکانی نامەخانەی میرانی بدلیس بووە. دەبێ ئەم دوو دەستنووسەی جزیری وەک (منافع الحیوان) لەنێو تالانیی نامەخانەی عبدال خانی ئەوەی شەرەفخاندا بووبن. لێکچوونی ئەم دوو وێنەیە بەڵگەیە بۆ ئەمەو، تا ڕادەیەکیش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم تابلۆیانەی

نێو شەرەفنامە دەستکردی (شەرەفخان)ن و بەڵگەیشە کە شەرەفخان لە تابلۆکانی خۆیدا سوودی لە وێنەکانی ئەم دەستنووسەی (منافع الحیوان) وەرگرتووە.

جێی باسە وێنەکێشی شەرەفنامە لە کێشانی وێنەی ئەسپدا لاسایی وێنەی ئەسپی نێو دەستنووسی (منافع الحیوان)ی نەکردووەتەوەو جیاوازی لەنێوان وێنەی هەردوو دەستنووسەکەدا هەیە. تەنانەت ئەوانەی شەرەفنامە وێنەی ئەسپیان زۆر بە جوانیو باریکو شووشی تێدا کێشراوە، وەک بڵێی وێنەکێش عاشقی ئەسپ بووبێو شەرەفخانیش سوارچاک بووەو لە چەندین شەڕدا بەهێزی ژێر فەرماندەیی خۆیەوە بەشداری کردووە وەک شەڕی (ڕەوان)و گورجستان لە۹۹۱ی (۱۵۸٤ی ز)دا.

عبدالرقیب یوسف لە (تابلۆکانی شەرەفنامە، بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر - ۱۹۹۸) لەبارەی ڕەنگە بەکارهاتووەکانی ناو ئەم تابلۆیانەی شەرەفخان، درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێ:

شەرەفخان لە تابلۆکانی شەرەفنامەدا جۆرەها ڕەنگی وەک سپیو سوور و زەردو کەسکو شینو ڕەشو پەمەییو پرتەقاڵیو زێڕیو زەیتوونیی بەکار هێناون. هێندێک لەو ڕەنگانە تۆخنو هێندێکیش کاڵو کراوە. بۆ ئاسمانیش خۆی بە یەک ڕەنگەوە نەبەستووەتەوەو، جاری وایە ڕەنگی شین (بڕوانە: تابلۆی ژمارە ۳و ۷و ۸و ۱۰و ۱٦)و جاری وایش هەیە ڕەنگی زێڕیی (وەک تابلۆی ژمارە ۵و ٦و ۱۱و ۱۲) بەکار هێناوەو، ئەمەیش لای هونەرمەندانی کۆن پێڕەوی کراوە. لە تابلۆی ژمارە (۱)دا ڕەنگێکی لەنێو زەردداو لە تابلۆی ژمارە (۹و۱۵)یشدا ڕەنگی مۆری بەکارهێناوە. نەخشی پێچاوپێچ (لولبی)یشی لە وێنەی ئاسماندا بۆ پەڵە هەور تەرخان کردووە.

هونەرمەند لە ڕەنگەکانیدا زۆر سەرکەوتوو بووە و زۆر ڕەنگو پلەکانی ڕەنگیانی (تۆن)ەکان-بەپێی ئەوکاتە بەکار هێناوە. بۆ نموونە لە تابلۆی شەڕی چاڵدێراندا زیاتر لە حەوفتا (۷۰) ڕەنگو پلەکانی ڕەنگی بەکارهێناوە کە بەڵگەی تواناییو باڵادەستیی ئەوە. هەروەها لە دابەشکردنی ڕەنگەکانیدا لەسەر ڕووی تابلۆ چ لە ڕەنگە گەرمو چ ڕەنگە ساردەکانو لەڕێکی (انسجام)یاندا سەرکەوتوو بووە.

هونەرمەند بەپێی مانای گشتیی تابلۆ ڕەنگەکانی بەکارهێناوە. بۆ نموونە لە تابلۆی سێزدەمدا کە لەبارەی نەخۆشی دەمارگیری (اعصاب)ەوەیە، ڕەنگی ئەرخەوانی (وەنەوشەیی)ی زۆری تێدا بەکارهێناوە کە مانای هێمنی دەبەخشێ، چونکە نەخۆشیی دەمارگیری پێویستیی بە کەشێکی هێمن (هادیء) هەیە. هەروەها تابلۆی جفات (مجلس)ی شەرەفخان کە زۆرتر ڕەنگەکانی تێکەڵاون لە مۆرو ئەرخەوانی. لە تابلۆی شەڕی چاڵدێراندا ڕەنگەکانی گەرمو ساردی تێکەڵاو کردووە لەگەڵ زۆرکردنی هێڵە چەماوەکان (خطوط منحنیە - مقوسات) تا مانای جۆشو خرۆش ببەخشێ کە ڕێکە لەگەڵ ئەو شەڕە گەورەیەدا.

# سەدەکانی ١٨ و ١٩ بەرهەمی میللی و هونەرمەندە نەناسراوەکان

نیگاری دوو دەسکە خەنجەری کوردی تەپران
هنری بیندەر وێنەی گرتووە لە کۆتایی سەدەی ١٩م

لەبەر نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی کە ئەرشیفخانە و مۆزەخانەیەکی نەتەوەیی کوردستانی دروست بکات و تێیدا ماتیریالە کولتوورییە نەتەوەییەکانمان بپارێزێت، دەبینین ئەمڕۆ زۆر بەدەگمەن تابلۆی یان بەرهەمە هونەرییەکانی سەدەکانی ڕابردوومان دەست دەکەوێت. ئەو تابلۆ و میناتۆرانەی لە سەدەکانی ١٨ و ١٩دا دەستمان کەوتوون زۆر دەگمەنن. ناوی هیچ هونەرمەندێکی نیگارکێشی کوردی ناوداریش لە سەدەکانی ١٨ و ١٩مدا پەیدا نییە. بەڵام لەگەڵ ئەمەش، توانیومانە چەند نموونەیەک لە کار و بەرهەمی هەندێ لە هونەرمەندی نیگارکێشی کورد (کە نازانین ناویان چییە و کێ بوونە) پێش چاو بخەین. کەواتە هاوزەمانی شەرەفخانی بەتلیسی و بەدرێژایی سەدەکانی ١٨ و ١٩، هونەری نیگارکێشان، جگە لە شێوازی میناتۆر، لای کورد بەردەوام هەبووە. ئەمەش لەم سێ شێوەیەدا:

یەکەم: نیگاری میللی، واتە ئەو نەخش و نیگارانەی کە لەسەر مافوور و فەرش و بەڕە، یان ئەوانەی لەسەر سندووق و کەلوپەلەکاندا دروستیان دەکردن. ئەمەش بێگومان

بەهایەکی هونەریی سەربەخۆی نەبووە و بەشێک بووە لە بەهای ماتیریالەکە خۆی - نەک وەک بەرهەمێکی سەربەخۆی هونەری خۆی پێشکەش بکات.

هونەرمەندە نیگارکێشەکان بریتین لە نەققارِ و بەردتاش و دارتاش و ئاسنگەرەکان؛ جگە لەو کەرەستە هونەرییانەی باسمانکردن، کەرەستەکانی ئەتنۆگرافیا و ئارشیتێکتوور ( بیناسازی) مەیدانێکی گرنگی نیگارکێشین لە کوردستاندا. بەشەکانی ئارشیتێکتووری ئەو سەردەمە بریتی بوونە لە: پەرستگاکان، کۆشک و تەلار و خانوو و بەرە و تاق و پەنجەرەکان، پرد و قەنتەرەکان. مەیدانەکانی ئەتنۆگرافیاش، بریتی بوونە لە: جلوبەرگ، کەرەستەکانی ناومالّ، سنووق و قاسە و لانک، چەک و جلوبەرگی شەڕ، ئامرازەکانی شەڕ، پۆشینی گیانلەبەران، زین، فەرش.

دووەم: میناتۆر و نیگاری نێو کتێب و دەستنووسەکان. ئەم جۆرە تابلۆیانە، بەها هونەرییەکانیان لەوانەی یەکەم زیاترە: چونکە هەمیشە وەک بەرهەمێکی سەربەخۆ خۆیان پێشکەش کردووە. ئەگەرچی لە بنەڕەتدا بە مەبەستی ڕازاندنەوەی کتێبەکە و بە نیازی ڕوونکردنەوەی بەشێک لە مەبەستی دەستنووسەکە ڕەسمکراون. جگە لەمەش دەزانین کە نیگار لە هەر سەردەمێکدا سروشتی خۆی و جەماوەری خۆی و شوێنی پیشاندانی خۆی و نرخی جیاوازی خۆی و تایبەتمەندێتیی خۆی هەبووە: لەو سەردەمانەدا نیگار بەو شێوەیە بووە!

گەڕیدەیەکی عوسمانی، ناسح مەترەقچی، لە ١٥٣٤ ـ ١٥٣٦ دا لە کوردستاندا گەڕاوە و سەفەرنامەیەکی نووسیوە و باسی کوردستانی کردووە: ئالّتوون کۆپری، دیاربەکر، کەرکووک. سەفەرنامەکەی بە ناوی سولەیماننامە بووە کە لە ١٥٤٥دا لەگەلّ کۆمەلّێک میناتۆردا بلاوکراوەتەوە. تەرجەمەی فەرەنسی و ئینگلیزی کراوە. بەشێک لەم میناتۆرانە کوردین و پەیوەندییان بە کوردەوە هەیە.

ڕازاندنەوەی بەرگی کتێب و دەستنووسەکان؛ نیگارکێشانی چیرۆکە دلّدارییەکانی وەک خورشید و خاوەر و لەیلا و مەجنوون، هەروەها وێنەکێشانی ئەفسانە و ڕووداوە مێژووییەکان لەنێو دەستنووس و کەشکۆلە کۆنەکاندا. هەندێک لەم دەستنووسانە لە کتێبخانە نیشتیمانییەکانی فەرەنسا و ئینگلتەرە و ئەلمانیا و ڕووسیا پارێزراون. لە سلێمانی کتێبخانەی کتێبفرۆشیی مەلا عەلی صەححاف لەلایەن مەلا برایمی قولەڕەشییەوە بەڕێوە دەچوو: کتێب فرۆشتن و بەرگ تێگرتن و چاککردن و نووسینەوە بوو. گەڕیدە بیانییەکانیش ڕوویان تێدەکرد. کتێبەکان بە نەخش و نیگاری جوان دەڕازاندرانەوە.

سێیەم: تابلۆی دروستکراوی دەست هونەرمەندە نیگارکێشەکان، کە ئەمەیان زۆرتر لە هونەریی شێوەکاریی مۆدێرنەوە نزیکە و زیاتر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەیانبینین.

# هونەری شێوەکاریی مۆدێرن

قوتابخانەی ڕواندز لە ساڵانی ١٩٢٠
کە جەواد ڕەسوڵ ناجی (لە دەستەچەپ سەدارەی لەسەرە)
لەوێی خوێندووە چالاکیی قوتابخانەکان ڕۆڵێکی فراوانیان هەبووە لە
بەرەوپێشەوەبردنی ئاستی هونەری شێوەکاری و ڕەسم لە کوردستاندا

# ئەو بارودۆخە شارستانی و مێژووییەی هونەری شێوەکاریی کوردی خۆی تێدا نوێ کردەوە

کێ بوو لەسەرەتادا ئەو پرسیارانەی پەیوەندییان بە «نوێ» و «نوێگەریتی»یەوە هەبوو لەلای خۆیدا کردنییە کەڵکەڵە و پێوەر بۆ داهێنان؟

فەیلەسوفەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری L age des Lumieres لە ئەورووپای سەدەی ١٨مدا بە ئاوایەکی دیکە کەوتنە توژینەوەی پێودانگە ئێستاتیکییەکان: فەلسەفەیەکی وایان دارشت کە نوێهاوردن بێتە بەڵگەیەک بۆ داهێنان؛ نوێگەری ببێتە پێوەرێک لە هونەر و ئەدەبیاتدا.

لە ساڵی ١٧٨٩ شۆڕشی فەرەنسا و دامەزراندنی سیستەمی پەرلەمانتاری، لەئاکامی ئەمەشدا بڵاوبوونەوەی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ و دەرک کردن بە بەها و ئازادییەکانی تاکەکەس، هاوزەمانی ئەمانەش شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشەکانی ئەنگلستان (١٨٢٦-١٨٥٦)، هەروەها درەنگتر ئەو بزاڤە فیکرییەی کە بە «سەردەمی ڕۆشنگەری» ناسراوە لە ئەورووپای سەدەی هەژدەمدا کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو بەسەر سەرهەڵدانی بیری تازەگەری Modernisme .

سەدەکانی کلاسیزم دنیای دەرەوەیان پیشان دەدا، مرۆڤ پێوەرێک نەبوو بۆ شتەکان. تەنیا سروشتێکی جاویدان و عەقڵێکی نەگۆڕیان هەبوو؛ دەستوورێکی گشتی سەقامی گرتبوو و نەدەبوایە هونەرمەندان لێی لابدەن. بەڵام لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٨ بەملاوە (لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا) ئەورووپاییەکان دەرکیان بەوە کرد کە ژیان و جیهان زۆر لەوە فراوانترە کە کلاسیکەکان تێی گەیشتبوون. نووسەر و هونەرمەندان چیتر پێویستی و منەتیان بەوە نەما گوێ لە «ئامۆژگارییەکانی» کلاسیکەکان ڕابگرن لەبارەی ئەوەی کە داهێنانی ئەدەبی بیبەسترێتەوە بە چەند دەستوورێکی نەگۆڕ و لە قاڵب دراو.

بەم شێوەیە نەسلی تازە لە شێوازی بیرکردنەوەی کلاسیکەکان بەتەواوەتی جودا بۆوە. هونەرمەندانی ئەوەی تازە ئامادە نەبوون چیتر بچنە ژێر رکێفی قەبوڵکردنی بیرکردنەوەی کلاسیکەکان، دەیانویست گفتوگۆ لەسەر مەسەلە جۆراوجۆرەکانی ژیانی خۆیان بکەن. دیکارت یەکێک بوو لە یەکەمین ئەو ڕەخنەگرانەی کە تۆوی مۆدێرنیزمی لە خۆیدا هەڵگرتبوو. لە ساڵی ١٦٣٧دا نووسیی: من تەنانەت نامەوێ ئەوەش بزانم ئاخۆ پێش من کەسی دیکە هەبوونە یان نا! ئەم بۆچوونەی دیکارت، نەک تەنیا بۆ ڕۆمانسی و نوێخوازەکانی ئەوزەمانە، بەڵکو تەنانەت بۆ دادایستەکانیش لە ساڵی ١٩١٦دا فەلسەفەیەکی «مۆدێرن» بوو و کردیان بە دروشمی خۆیان.

ژان ژاک ڕۆسۆ ١٧١٢- ١٧٧٨، فەیلەسوفی ڕۆشنگەری فەرەنسی، جەختیی کردە سەر پێویستیی خۆئازادکردن لەدەست تێڵی دابونەریتەکانی کۆمەڵ و ڕەفزکردنەوەی یاساکانی کۆمەڵگە. فەیلەسوفی ئەڵمانی، ئیمانوئێل کانت ١٧٢٤-١٨٤٠ چێژی جوانیناسیی بەستایەوە بە سەرنجدەرەوە نەک بە بابەتەکەوە. کانت پێی وابوو جوانی لەناو خودی شتەکەدا نییە، بەڵکو

لەو تێگەیشتنەدایە کە لای بینەر بۆ جوانی هەیە. بەمەش سیفەتێکی ڕێژەییانەی بەخشییە «جوانی»: کاری کردە سەر ئەوەی کە چیتر تاکەکەس گوێڕایەڵی چێژی باوی گەلەکەی نەمێنێتەوە.

ناوەڕۆک، بە تێگەیشتنی کانت، شێوەیە نەک واتا. لە تابلۆیەک یان لە پەیکەرێکدا تەنانەت لە هەموو هونەری پلاستیکی و ئارشیتێکتووریدا، ناوەڕۆک تەنیا نیگارەکانە. ئەوەی سەرنجراکێشە واتا نیە بەڵکو شێوەکەیەتی، کە حاڵەتە بنچینەییەکە بۆ چێژوەرگرتن خۆش دەکات. ئەو ڕەنگانەی وێنەکانیان پێ کێشراوە هێند سیحراوین کە دەتوانن هەر بابەتێک بۆ واتا دروستکردنی خۆیان بدۆزنەوە.

بەم شێوەیە، لەڕێگەی بڵاوبوونەوەی بیری کانتەوە، جوانی، چیتر وەک باوەڕێکی باوی کلاسیک نەمایەوە: لە بابەتییەوە گۆڕا بۆ ڕێژەیی و خۆیی. ڕۆمانسی و پەرناس و سمبولیست و تەنانەت فۆرمالیستەکانیش سوودیان لێ وەرگرت.

هەر لەو سەروبەندەدا، ڕێبازی ڕۆمانسیزم دێت بیری تاکەکەسی و فەرمانڕەوایەتیی من Le Moi لە هونەردا دەچەسپێنێ و تاکڕەوێتی لەجیاتی کۆمەڵڕەوی دادەنێ. ویلیام وۆردس وۆرث ١٧٧٠-١٨٥٠ W. Wordsworth لە پێشەکیی ئەو دیوانە شیعرە هاوبەشەدا کە لەگەڵ کۆلریدج پێکەوە لە ١٨٠٠دا بڵاویان کردەوە، نووسیی: «ئامانجی سەرەکیمان لەم هەڵبەستانە ئەوەیە کە ڕووداو و هەڵوێستەکان لە ژیانی عادییەوە هەڵبژێرین و چەندی پێمان بکرێ بە زمانێک وەسفیان بکەین کە زمانی خەڵک بێت».

فەیلەسووفی فەرەنسا، برجسۆن ١٨٥٩- ١٩٤١ دووای ئەوان، چەمکی خۆی بۆ نوێخوازی لێک دەداتەوە و دەڵێ کە هونەرمەند شتێک بەدی ناهێنێ لەمەوپێش مومکین بووبێت و ئەو کردبێتی بە واقیعی. کاری هونەری شتێکی تەواو تازەیە و بریتی نیە لە ڕێکخستنەوەی ئەو شتانەی لەمەوپێش بوونیان هەبووە.

بەشێوەیەکی گشتیش، سەدەی ١٩م سەردەمێکی ڕەخنەگرانەیە، سەردەمی دەسەڵات پەیداکردنی بیری زانستییە. فریدریک نیتشە ١٨٤٤-١٩٠٠ ئەو سەردەمەی خۆی ناوناوە «سەردەمی ئیرادەی بێ سنووری گەیشتن بە هوشیاری». ناوبراو بووە سروشپێدەری سێ ڕێبازی مۆدێرنی زۆر یاخی و تازەکەرەوە، ریالیست و سمبولیست و تەعبیرییەکان: ڕەخنەگرتن لە دین، بە سووک سەیرکردنی ناسیونالیزم، تێکدانی بایەخە کۆنەکان و ئەو فەلسەفانەی ڕۆحی موغامەرەیان نەمابوو.

ئنجا لە ساڵی١٨٨٦ بەیاننامەی سمبولیستەکان هەرایەکی زۆری دروستکرد و بیری نوێگەرێتیی زیاتر بەردو پێشەوە برد. بۆدلێر، ستێفان مالارمێ، ڤێرلێن، ڕامبۆ، ئۆسکار وایلد ١٨٥٦- ١٩٠٠، پەرەیان بە بیری مۆدێرنیزم دا. شارل بۆدلێر١٨٢١- ١٨٦٧) دەیگوت: «جوانی پێویستە هەمیشە نامۆ و سەرسوڕمێن بێت».

بەم شێوەیە، چەمکی «نوێ» و بیری «نوێگەری» و «تازەکردنەوە» لە سەرەتادا ڕووناکبیرانی ئەورووپایی سەدەی ڕۆشنگەری و سەدەی نۆزدەهەم دروستیان کرد: لەسەر دەستی

ڕۆمانسییەکانەوە دەستی پێکرد و پاشان وردە وردە لای پەرناس و سمبوولیستەکان پەرەی سەند: تا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە لەڕێگەی ئەستەمبوڵەوە، واتە لەڕێگەی هونەرمەند و نووسەرە گەنجەکانی تورکیای عوسمانلییەوە کەوتنە ناو فەرهەنگی میللەتانی چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و خەڵکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتەوە، ئنجا دوواتر ئێمەی کوردیشەوە.

ڕێچکەی نوێگەری لە هونەری شێوەکاریی کورددا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەست پێ دەکات؛ چونکە لەوکاتەوەیە کە چەند گۆڕانکارییەکی بنچینەیی بەسەر نەخشەی کوردستان و ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کورددا دێت. هەر لەو ماوەیەشدا بۆ یەکەمین جار، لە ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) لە سالی ١٩١٨ لە ژمارە ٢٣ و ٢٤دا، زاراوەی نوێخوازی یان تازەگەرایی و مۆدێرنیزم (تەجەدود و موجەدید) دەکەونە سەر زاری شاعیر و ڕەخنەگر و نووسەرانمانەوە.

کوردستان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، کە سەردەمی دابەشکردنێکی تازەی کوردستان بوو، بە ژیانێکی هەژەند و پڕ لە کارەساتی ئەوتۆدا ڕەت دەبوو کە هەر هەفتەیەکی ژیان ڕاپەرینێک بوو، هەر مانگێک لاپەڕەیەکی درەوشاوەی مێژوویی بوو، گۆڕانکارییەک بوو. بەکورتی: ئەو هۆکارانەی بوونە پاڵپشتی گۆڕانکارییەکان لە بەستێنی هونەردا، ئەمانە بوون:

١- بڵاچەدانی هەستی ناسیونالیستی و بزووتنەوە نەتەوەییە چەکدارییەکان، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم کە ڕێگەیان خۆش کرد بۆ سەرهەڵدانی ژیانێکی نوێی هونەری و تازەبوونەوەیەکی کولتووری.

هەروەها سەرکەوتنی شۆڕشی پرۆلیتاریا (ئۆکتۆبەری سالی١٩١٧ لە ڕووسیا) بەتایبەتی لەڕووی ئایدیۆلۆژی و مەعنەوییەوە، بەسەر بیری زۆربەی هونەرمەند و نووسەرانی کوردی سالانی ١٩٢٠- ١٩٥٠ ڕەنگی دایەوە. پاشانیش جەنگی یەکەمی جیهانی ١٤-١٩١٨ بە هەموو ڕووداوە دڵتەزێنەکانییەوە کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو بەسەر ژینگەی هونەریی سەرەتای سەدەی بیستەم.

ئەم ڕووداوە هەژەندانە وایانکرد بیری ئێستاتیکی و تێگەیشتنی جوانیناسیی هونەرمەندانی کورد گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا بێت: وای لە هونەرمەندانی کورد کرد کە لە بیرکردنەوەی کۆنی ئیسلامەتی و خەڵوەتنشینی و سۆفیگەری و میناتورسازی بێنە دەرەوە، لە زەغرەفەکارییەکانی نێو پەڕ و بەرگی زەردهەڵگەڕاوی نێو کتێبەکانەوە بێنە دەرەوە و واقیعگەرایانە ڕووبەڕووی ژیانی تازە ببنەوە؛ بابەتی وێنەکانی خۆیان چیتر تەنیا بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەی کتێب نەبێت، بەڵکو لە واقیع و ژیانەوە هەڵیانبگوزن و لەپێناو خۆشترکردنی ژیانی نەتەوەکەیان کاربکەن. هەر لە ناکامی ئەم هەستە نەتەوەییەوە، هونەرمەندان بەرەو سەرچاوە و ڕووداوە نیشتیمانی و ناوچەیی و کەلەپوورە نەتەوەییەکان دەگەڕێنەوە. حەسەن فەلاح وێنەی شەڕی دەربەندی بازیانی شێخ مەحموودی کێشا دژی ئینگلیز، دانیال قەصاب وێنەی قەلا و منارەی هەولێر، عەزیز سەلیم وێنەی جوتیارە کوردەکان.

٢- دروستبوونی دەیان ڕێکخراوی سیاسی و پیشەیی، دامەزراندنی دەیان کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی لە ناوەوەی کوردستان و لە دەرەوەیدا: لە ئەستەمبوڵ، قاهیرە، ژنێف، بەغدا، دیاربەکر، سلێمانی، هەولێر. ئەمەش هەر لە ساڵی ١٨٠٠ بەملاوە.

زۆربەی دامەزرێن و ئەندامانی ئەم کۆمەڵە و ڕێکخراوانە نووسەر و هونەرمەند و ڕووناکبیرانی گەنج بوون، لە سەرەتادا ئاوارەی ئەستەمبوڵ و پایتەختەکانی ئەورووپا، پاشانیش گەڕانەوە بۆ کوردستان. ئەم کۆمەڵە و ناوەندە جۆراوجۆرانە و بڵاوکراوەکانیان بەکاردەهێنا بۆ دەربڕینی نوێگەرایی و تازەکردنەوەی ئەکولتووری. لەناو باخچە و هۆڵ و ژوورەکانی ئەو یانە و کۆمەڵە و ڕێکخراوانەدا بوو کە شیعر دەخوێنرانەوە و سیمینار پێشکەش دەکران و کۆڕ و کۆبوونەوە ئەدەبییەکان سازدەکران. هەر یەکێکیش لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانە بڵاوکراوەی خۆیان هەبووە کە بەرهەمی مۆدێرنی بڵاوکردۆتەوە.

ئەو هونەرمەندە گەنجە کوردانە کە لەناو ڕێکخراوە پیشەیی و سیاسی و کولتوورییەکاندا کاریان دەکرد - بەپێچەوانەی شێخ و مەلا و میرە کوردەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەم - بزووتنەوە نەتەوەخوازییەکەی ئەوسەردەمەی کوردستانیان، لە ئاستی سەرزارەکییەوە، لە ئاستی کاردسات و ڕاپەڕینە چەکداری و ڕۆژنامەکانەوە گەیاندە ئاستی نووسین و هوشیاری و ئایدیۆلۆژیا و بەرهەمی هونەری.

٣- هاتنی ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسە ڕۆژئاواییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەشێوەیەکی فراوانتر و زیاتر بۆ کوردستان، واتە کارکردنیان لە بواری زمان و کولتووری کوردەواریدا زەمینەیەکی پتەوی سازکرد بۆ ئەو ڕێنسانسە کولتوورییە کوردییە. وایان لە ڕووناکبیر و هونەرمەندە کوردەکان کرد کە بەهای ئەم کولتوورە نەتەوەییەی خۆیان بزانن و کاری بۆ بکەن.

دووای ئەمەش داگیرکرانی کوردستانی عیراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە و بوونی ئینگلیزەکان لە کوردستانی چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، هەروەها لە کوردستانی سووریاشدا بوونی فەرەنسییەکان و ڕێگەدان بە کورد کە بتوانن بە زمانی خۆیان بنووسن هەروەها دامەزراندنی چاپخانە و قوتابخانە و بڵاوکردنەوەی چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی وەک پێشکەوتن (سلێمانی: ١٩٢٠ ـ ١٩٢٢) و تێگەیشتنی ڕاستی (بەغدا: ١٩١٨)، گۆڤاری هاوار لە دیمەشق ١٩٣٢.

ئەم چاپەمەنی و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوانە لەڕووی تەصمیم و نەخشەسازی و ڕازاندنەوەی لاپەڕە و بەرگ وایانکرد هونەری گرافیک سەرهەڵبدات و ئاستی شێوەکاری و نیگار و وێنەسازی بەرەوپێشەوەتر هەنگاو بنێت.

هاتنەئارای چاپخانە سیستەمی ڕۆشنبیریی لە دەستنووسەوە گواستەوە بۆ سیستەمی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەگەری. چاپخانە لە ئاکامدا جەماوەرێکی خوێندەوار و خوێنەری فراوانتری (هەزارانی) دروست کرد. چاپخانە ئەدەبیاتی لە چوارچێوەی مەلا و شێخ و فەقێ و مەولانەکانەوە گواستەوە بۆ چوارچێوەی فراوانی هەموو ڕۆڵەیەکی نەتەوە. بەکورتییەکەی: چاپخانە کولتووری

لەدەست مەلا و سەرپژاردەی «کۆمەڵگەی موسڵمان» سەندەوە و دایە دەست هەموو فەردێکی کۆمەڵ.

٤- لە ناکامی بزووتنەوە ڕێکخراوەیی و ڕاپەڕینە نیشتیمانییەکاندا، چەند پێداویستی و دیاردەیەکی تازەی شارستانی هاتنە ئاراوە: دامەزراندنی یەکەمین قوتابخانە کوردییەکان و بەرزبوونەوەی ئاستی تەکنەلۆژی و رۆشنبیری و خوێندەواری لەناو گەلدا؛ پاشانیش لەڕێگەی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەرییەوە: بزاڤی وەرگێڕان.

لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، لە ١٨٩٢ تا ١٩٠٧ لە ئەستەمبۆڵ قوتابخانەیەکی گشتی بە ناوی (عەشیرەت مەکتەبی) هەبوو کە منداڵانی کوردیش دەیانتوانی زمانی عوسمانی و عەرەبی فێر بن. هەروەها لە سلێمانی، لە ١٨٩٣ بەملاوە قوتابخانەی روشدیەی عەسکەری کرایەوە کە دەرچووەکانی دەنێردرانە بەغدا و ئەستەمبۆڵ بە مەبەستی تەواوکردنی زانستەکانی عەسکەری. ئەمین زەکی بەگ و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و مەعرووف جیاوک و ئەمین رواندزی و دەیانی دیکە.. دەرچووانی ئەم قوتابخانەیەن.

ورده ورده دەیان قوتابخانەی دیکە لە کوردستاندا سەریان هەڵدا ولە کۆتاییدا قوتابخانە بۆ کچانیش دەرگاکانیان کەوتە سەر پشت. چالاکییەکانی ئەم قوتابخانە و کۆمەڵە و ڕێکخراوانە، ڕۆڵێکی دیاریان هەبوو بەسەر بووژاندنەوەی رۆشنبیری و ئەشونمای جموجۆڵی ئەدەبی و هونەری و شێوەکاری. قوتابخانەکان، بەتایبەتی چالاکییە شانۆیی و کولتوورییەکانیان و پێشانگاکانی نیگارکێشان، ڕۆڵیان هەبووە لە بلاوکردنەوەی چەمکە کولتوورییە تازەکان و نوێکردنەوەی چێژی ئیستاتیکیی خەڵک. لە رۆژنامەی ژیان، لە ژمارە ١٩، لە ٥ی ٨ی ١٩٢٩دا نووسراوە:

وەزارەتی مەعاریف ئەم ساڵ بیست طەلەبە ئەنێرێ بۆ دارالفنوونەکانی ئینگلتەرە، ئامریکا، بەیرووت، میسر. ئەمانە لە فەننی تەربیە و تەعلیم، هەندەسە، ئەلکتریک و زراعەتدا تەحصیل ئەکەن.

بێگومان ناردنی قوتابیانی کورد بۆ دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن و گەڕانەوەیان بۆ وڵات، زەمینە خۆش دەکات کە لە داهاتوودا ڕۆڵەکانی کورد فێری زمانی تازە و کولتووری ڕۆژئاوایی بن، سوود لە هونەرە جوانەکانی ئەو وڵاتانە وەربگرن و لە وڵاتی خۆیاندا بەرهەمیان بێننەوە.

٥- دروستبوونی پەیوەندییەکی کولتووریی بەهێز، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کورددا، لەنێوان کولتووری کورد و کولتووری ڕۆژئاوا، واتە لەنێوان هونەرمەندانی کورد و کولتووری ئەورووپیدا.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم بەملاوە، بەشێکی زۆری روناکبیرانی کورد «گەنجە کوردەکان»، لە هەر چوار پارچەکانی کوردستانەوە روویان کردبووە ئەستەمبۆڵ و ئەورووپا. ئەو نووسەر و رووناکبیرە کوردانە بەشی هەرە زۆریان بە خواستی خۆیان پەرتەوازەی شاری ئەستەمبۆڵ و پاستەختەکانی ئەورووپا ببوون. لەوێ- لە لایەکەوە لە ژێر کاریگەرێتیی کولتووری ناسیۆنالیستی تورک و ئەرمەندا، لەلایەکی دیکەشەوە لە ژێر کاریگەرێتیی راستەوخۆی کولتووری ئەوروپی، بەتایبەتی فەرەنسیدا- دەیانویست دوورەوڵاتبوونی خۆیان بکەنە تریبوونێک

بۆ بووژاندنەوەی جموجوڵی ناسیونالیستی کورد و تازەکردنەوەی کولتووری کوردی.

لە سەدەی ١٨مدا پێشکەوتنێکی دیار، بۆ نموونە لە هونەری شێوەکاریی عوسمانیدا ڕوودەدا: عبدالجلیل لەونی پەیدا دەبێت و کاریگەرێتیی ڕۆژئاوا بۆ ناو میناتۆری عوسمانی دەگوازێتەوە. هەر لەم سەدەیەدا سیماکانی ئافرەت و ژنایەتی لەناو میناتۆردا ڕوونتر و زیاتر دەردەکەون، جگە لە ڕەنگدانەوەی واقیع و ژیان لەناو تابلۆکاندا.

هەر لەم چەرخەدا پەیوەندییەکی کولتووری و هونەریی بەهێز بۆ یەکەمین جار لەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕۆژئاوا سەرهەڵدەدات و دەیان نیگارکێشی ئەورووپی دێنە ئەستەمبوڵ و لەوێ دەژین. درەنگتریش دەیان نیگارکێشی تورک لەوانە محمد علی پاشا و عثمان حمدی بگ و سعید بگ حسنی یوسف بگ کە نیگارکێشی ناوداری عوسمانین، بۆ خوێندنی نیگار دەچنە پایتەختەکانی ئەورووپا و لەلای ناودارترین نیگارکێشە ئەورووپاییەکانی ئەوێ کاردەکەن و پاشان کاریگەرییە ئێستاتیکە مۆدێرنەکان درەنگتر دەگوازنەوە بۆ ناو هونەری عوسمانی. ئەمە جگە لە کردنەوەی چەندین پەیمانگەی هونەرە جوانەکان ی وەک مهندسخانەی بریەی همایون و دارالبدائع العثمانی لە سەرەتای سەدەی ١٩مدا کە بنەماکانی شێوەکاریی ڕۆژئاوایی تێدا دەخوێنرا: تا لە ساڵی ١٨٨٣ مکتب صنایعی نفیسە لە ئەستەمبوڵ بۆ ئافرەتانیش دەکرێتەوە.

بەم شێوەیە هونەری شێوەکاریی مۆدێرنی عوسمانی لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩م بەملاوە دەگەشێتەوە و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەناو میللەتانی کوردیش بڵاودەبێتەوە.

بە هەمان شێوە لە ئێرانی ئیمپراتۆریەتی قاجاری و پەهلەویشدا، واتە لە سەدەی ١٨ و ١٩مدا، چەندین پەیمانگەی شێوەکاری و نیگاری وەک دارالفنون دەکرێنەوە کە قوتابیانی بەهرەمەندی وەک کمال الملک تێیدا دەخوێنن هەروەها چەندین قوتابییش دەنێردرێن بۆ ئەورووپا بۆ خوێندنی هونەری شێوەکاریی مۆدێرن و کاتێ دەگەڕێنەوە بنچینەکانی شێوەکاریی ئەورووپا بە ئێراندا بڵاودەکەنەوە. بێگومان هەموو ئەمانە کاریگەرییان بەسەر کوردیشەوە هەبووە.

جگە لەمانە، دوورەوڵاتیی خواستمەندانەی (گەنجە کوردەکان) لە ئەستەمبوڵ و ئەورووپا بە هەنگاوێکی باش لە قەڵەم دەدرێت لە مێژووی دوورەوڵاتیی کورددا کە وەک دەستاوەردێک بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو بەکاری بهێنن لەپێناو تازە کردنەوەی ژیانی کولتووریی کورد.

ئەو ڕووناکبیر و نووسەرانە لە ١٩٢٣ بەملاوە، دووای قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی و ڕاوەدوونانی ڕووناکبیرە کوردەکان لەلایەن ڕژێمی تورکیاوە، پەیتا پەیتا، گەڕانەوە بۆ کوردستان (بەتایبەتی بۆ کوردستانی عیراق). لەوێش ئیترماڵێکی کولتووریی هێندە ڕەسەن و بەبەرشتیان دروستکرد کە تا ئەمڕۆش ئێمە لە سای بەرهەم و سێبەری ئەواندا دەژین.

دروستبوونی ئەم پەیوەندییە کولتوورییە بەهێزە بە نوقتەگۆڕان و وەرچەرخانێکی کولتووری دەژمێردرێت بەرەو تازەبوونەوە.

■

# کرۆنۆلۆژیای
# هونەری شێوەکاریی مۆدێرن لە کوردستاندا
## ١٩٠٠ - ١٩٥٨

رۆشنبیر و خوێندەوارە کوردەکانی سەردەمی کۆن پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ هونەری ڕەسم و نەققاشیدا هەبووە؛ ڕێز و خۆشەویستییەکی زۆریان لە هەمبەر ئەم هونەرەدا نواندووە. شاعیرانی کلاسیکی کورد هونەری شێوەکاریـیان لە کۆنەوە ناسیوە و زانیویانە کە هونەری نیگارکێشی پەیوەندییەکی توند و تۆڵی بە هونەری شیعرەوە هەیە. دەرکیان بەوە کردووە کە ئیستاتیکای ئەم دوو هونەرە (شیعر و نیگار) ستراتیژیان، ئامانجیان، وەک ماری عاشقە و ماشقە، چەند یەکانگیر و هاوتەوایە. لە سەدەی ١٧مدا، ئەحمەدی خانی ( ١٦٥٠ ـ ١٧٠٧ ) وشەی عەکس و نەقش و نەقاشیی بەکارهێناوە:

**گەنجینەئی جەوهەری بیت فاش　　　ثابت ببتن ژ نەقشی نەقاش**

ناوبانگی مانی ی نیگارکێش ڕەنگی داوەتەوە لە شیعری کۆنی کوردیدا: ناوی ئەو هونەرمەندە لەسەر دەمی زۆربەی شاعیرانی کورد بووە، بەتایبەتی لە سەدەی ١٩م بەملاوە، بۆ نموونە لای نالی:

**نووکی خامەی من کە بێتوو مەعنا ئارایی کەمال**
**خەط بە خەط ئیضهاری نەقشی سوورەتی مانی دەکا**

یان دەڵێ:

**حـوقـقـێکی زەری صافی لەسەر بانی ترابێ**
**تەختێکی بە صەد صەنعەتی مانی قلەشابێ**

هەروەها کوردی دەڵێ:

**کە مانی هاتە سەر کێشانی ئەبرۆی تۆ لەپاش چاوت**
**لە مەستی دەستی وا لەغزی کە کەج هات خەتی پەرگاری**

یان صافی:

**کەسێ بەم عەسرە نەیدیوە بەشەر وەک تۆ بە شیرینی**
**تەحەییور ما لە تەصویرت ئەگەر نەققاش ئەگەر مانی**

ئاگاداریی شاعیرانمان لە هونەری ڕەسم و نەققاشی لای میللەتانی تری وەکو چین و فارس دیاردەیەکی بەرچاو بووە. دیارە ئەم نەتەوە بێگانە و دراوسێیانەش تابلۆ و بەرهەمەکانی خۆیان

گەیاندۆتە کوردستان. سالم دەڵێ:

**بە نیگاری عەجەمی شێوەی تۆ نایەتە زەبط**
**تازە ئاموختە مشتاقی دەکا خەطی ئەمیر**

کوردی دەڵێ:

**ئەهلی چین نەققاشی چاکن خۆ، بەلاَن تەصویری تۆ**
**نەقشی خامەی کردگارە کاری وەستای چین نیە**

بەکارهێنانی بیری نیگارکێشی و وێنەگرانە لە شێوازی دەربڕینی کلاسیکەکانماندا دیسان باو بووە. سالم دەڵێ:

**دەکێشێ خوێنی سالم صوورەتی تۆ**
**وەکو مەنصوور ئەگەر ببڕێتە سەر دار**

یان کوردی:

**سروشکم نەخشی ناوی تۆ دەکێشێ**
**جێگای سێدارەکەی مەنصوورە ئەمشەو**

بەم غوونە و بەڵگانەوە هەمووی دەسەلمێ: رەسم لای کورد دیاردەیەکی نامۆ نەبووە. نەخش کێشان، خەتی پەرگار، نەخش، تەسویر، نەققاش، نیگار، شێوە، خەط، نەقشی خامە، نیگاری عەجەمی» .. هتد. هەموو ئەم زاراوە و وشانە و دەیانی دیکە لەسەر زاری شاعیرانی کورد دووپات بوونەتەوە. ئەم دیاردەیەش ئەوە دەگەیەنێت کە زمانێکی دەربڕینی هونەری بۆ باس و خواسی هونەری رەسم لە کوردستاندا و لەناو شاعیر و رۆشنبیر و خوێندەوارانی کورددا هەبووە.

هونەری شێوەکاریی مۆدێرن لە کوردستاندا، سەرچاوەکانی خۆی لە پێنج کەناڵەوە هەڵێنجاندووە:

**١- هونەری پەیکەرتاشیی دێرین و ئارشیتێکتووری نەتەوەیی کوردستانی دێرین.**

ئەمە بریتییە لە بەرهەمی پەیکەرتاش و نەققاڕ و بەردتاش و دارتاش و ئاسنگەرەکان: کە بەشێکیان بریتین لە پەیکەرەکان، بەردەنووسەکان، پەرستگاکان، کۆشک و تەلار و خانوو و بەرە و تاق و پەنجەرەکان، پرد و قەنتەرەکان.

**٢- هونەری میللی و کەلەپووری ئێتنۆگرافی.**

هەر لە کۆنەوە، گەلی کورد سەرچاوەی چێژ و بینینی خۆی لە رەنگی بەردەبیان و ئێوارە و سروشتە جوانەکەیەوە هەڵێنجاندووە. فۆلکلۆر و کەلەپوورە ماددیەکەی نوقمەساری زەریای رەنگ و شەبەنگ بووە، بە پەلکەزێڕینەی ژیانی ناو شاخ و شار رەنگرێژ بووە.

هونەری نیگارکێشانی فۆلکلۆریی کوردی، لەو سەردەمەدا، خاسیەتە نەتەوەییەکانی خۆی، لە رێگەی کەلەپوورە میللییەکەیەوە، باش پاراستووە: بەرگەبالیف، بەرگە تاق، سەکەڵەی ولاغ،

تاسکلاو، چارۆگە، سوخمەی قۆڵدار، شەدە، سەرپەردە، دامێنی کەوای ژن، نەخشی سەر خەنجەر، چنینی فەقیانەی ژنان، بەرگ رادیۆ، قەنەویچە، سەرزین، سەرسەڵتە، گوڵنگی جامانە، هەوری، نەخشی سەر دۆلاب و سنووق، چوارچێوەی ئاوێنە و رەسم، نەخشی سەر بەرە و مافوور، کوولەی چارپایە، سەرگۆرەوێ... سەدان نەخش و نیگاری فۆلکلۆریی دیکە؛ نیشانەی بایەخدانی تایبەتی گەلی کوردن بە رەنگ و هێڵ و نیگار و جوانی و شێوەکاری، کە خەسڵەت و سیمای نەتەوەیی کوردییان تا ئەمرۆش پێوە دیارە.

**٣- میناتۆرەکان.**

ئەو میناتۆرانەی کە هونەرمەند و دانەرەکانیان کورد بوون و بە ناوی تورک و فارس و عەرەبەوە چوونەتە ناو مێژووەوە، هەروەها ئەوانەی شەرەفخانی بەتلیسی، جگە لەو هەموو میناتۆرە کوردییانەی کە بێ ئیمزا لە مۆزەخانەکاندا پارێزراون.

**٤- نیگاری هونەرمەندە نەناسراوەکان.**

دەیان هونەرمەندی نیگارکێشی کورد لە کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی بیستەمدا تابلۆیان دروست کردووە و بەرهەمەکانیان کۆنەکراونەتەوە؛ یان بە نیگارەکانیان کتێبی نووسەران و شاعیرانیان رازاندۆتەوە.

**٥- هونەری شێوەکاریی رۆژئاوا کە لەسەرەتادا، لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە، لەرێگەی میللەتانی دراوسێوە پێیان ئاشنا بوون: پاشان راستەوخۆ کەوتنە هەڵمژینی رێبازە هونەرییەکانی رۆژئاوا.**

هونەری نیگارکێشان لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەولاوە، لە ئەنجامی پەیوەندی لەگەڵ رۆژئاوا، لەلایەکی دیکەشەوە لەئاکامی پێشکەوتنی هەستی نەتەوایەتی و سەرهەڵدانی چاپخانە و پێشکەوتنی چاپەمەنی و تەکنەلۆژیا، بەرەو پێشەوە هەنگاوی نا.

کورد هیچ دەوڵەتێک یان وەزارەتێکی رۆشنبیریی نەبووە کە بتوانێت وەک دەوڵەتی ئێران و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هونەری نیگارکێشانی نەتەوەیی خۆی پێ بیووژێنێتەوە، کورد دەسەڵاتی ئەوەی نەبووە بێت ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان بۆ رۆڵەکانی خۆی دروست بکات یان بێت قوتابی و خوێندکار بە شاند بنێرێتە زانکۆکانی پاریس و لەندەن بۆئەوەی لە کۆلێژەکانی هونەری ئەوێ بخوێنن و پاشان بگەڕێنەوە وڵات پەرە بە هونەری نیگار بدەن و هونەرمەندی وەک کەمال الملکیان لێ دربچێت و هونەری نیگار نۆژەن بکەنەوە. تەنانەت تا ئەم دواییەش پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا لە قوتابیی کورد قەدەغە کرابوو؛ بەلام لەگەڵ ئەمانەش کورد توانیویەتی مێژوویەکی هونەری شێوەکاری بۆ خۆی دروست بکات و تەنانەت ئەمەتا وەک لێرەدا دەبینین: هاوهەنگاوی عەرەب و تورک و فارس، هەوڵی داوە هونەرەکەی خۆی، لەگەڵ دەسپێکی چەرخی بیستەم، تازە بکاتەوە: خوێنێکی گەش و تازە وەبەر گیانی هونەری شێوەکاریدا بکاتەوە...

## چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم

### قۆناغی سلاو و کۆپی کردن

لە چارەگی یەکەمی سالانی (١٩٠٠) دا، واتە لە سەردەمی کۆتایی دەسەلاتی عوسمانییەکاندا، لە هەولیر، بەپێی سجللاتی کۆنی پەروەردەی هەولیر، وانەی "لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و ئال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت" دەخوێنرا. کەواتە، دەرسی رسم و هونەرە دەستییەکان بەشێک بوونە لە پێداویستییەکانی خوێندن و پەروەردە لە هەموو شارەکانی دیکەی کوردستانی عێراقدا: قوتابییان فێر کردووە چۆن رەسم بکەن و چێژی ئیستەتیکی لە نیگار و هونەرە وێنەییەکان وەربگرن. لەوەش دەچێ لەو کاتەدا پیشانگە و میهرەجانی هونەریی قوتابییان کرابێتەوە. میهرەجانە هونەرییەکانی سلێمانی لە سالانی (١٩١٠) و (١٩١٢) بەولاوە پەیدا بوونە.

بە رای د. سلسل العانی: "پێشەنگی هونەری شێوەکاری لە عێراقدا هونەرمەندێکی کوردی خەلکی سلێمانی بووە و ناوی عوسمان بەگ بووە". د. سلسل العانی لەم بارەوە گەواهی دەدات: (دەلێن لە سالانی سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە شاری سلێمانی، عوسمان بەگ ناوێک کە نیگارکێشێکی شارەکە بووە، دەچووە ناو گۆرستانی شار و رەسمی ئەو ژنانەی دەکرد کە لەسەر گۆرەکاندا لەناو گول و سەوزاییدا دادەنیشتن. ئەم دیاردەیە لەو سەردەمەدا بە شتێکی ناجۆر و سەیر دەزانرا و ژنان لە هەموو لایەک باسیان دەکرد. بەلام لەگەل ئەوەش تا ئێستا ئێمە هیچ تابلۆیەکی ئەو هونەرمەندەمان بەدەست نەگەیشتووە). هەروەها لەم بارەوە جبرا ابراهیم جبرا دەلێ: "لە گۆرستانێکی سلێمانیدا لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ئەفسەرێک بووە ناوی عوسمان بەگ بووە، وێنەی ئەو نافرەتانەی کێشاوە کە دیدەنیی گلکۆی مردووەکانیان کردووە، ئەو نافرەتانەی کە گول و سەوزایی و بەهار دەورەیان دابوون. ئەگەرچی هیچ تابلۆیەک لەو تابلۆیانەی ئەم هونەرمەندە کوردە (عوسمان بەگ) نەماون، بەلام تا ئێستا یادی ئەو هونەرمەندە هەر ماوەتەوە".

**(١٩١٣)**

- لەو ماوەیەدا لە بەغدا ئەسلێکی تازەی دوو رەگ دەکەونە کاری شێوەکاریی مۆدێرن بەتایبەتیش عبدالقادر الرسام، کە دەرەنگتر کاردەکەنە سەر نیگارکێشە کوردەکانی سالانی ١٩٣٠ و ١٩٤٠.

- گۆڤاری (رۆژی کورد) لە ئەستەمبول، یەکەم گۆڤاری کوردییە کە تابلۆ و وێنەی فۆتۆگراف بلاودەکاتەوە: نیگارێکی تەختیتی سەلاحەدینی ئەییووبی لەسەر بەرگی ژمارە (١) دا، نیگارێکی تەختیتی کەریمخانی زەند لەسەر بەرگی ژمارە (٢)دا، وێنەیەکی فۆتۆگرافی حسێن کەنعان پاشا بەدرخان لەسەر بەرگی ژمارە (٣)دا.

- لە سالی١٩١٦ کوردستانی ئێران بە هەمان شێوە سەرەتایەکی سادە و جوانی هونەری

شێوەکاریی مۆدرێرن دەستی پێکردووە. مینۆرسکی لەناو بازاڕی مەهاباد تابلۆیەکی مۆدێرنی کڕیوە و پێشکەشی کردووە بە مەکەنزی. تابلۆیەکە وێنەی کوردێکی مهابادییە بە جلوبەرگی کوردییەوە. لەم کتێبەدا تابلۆکەمان بلاوکردۆتەوە.

(١٩١٩)

- دەرکەوتنی رەسم و تەختیتەکانی یەکەم نیگارکێشی سلێمانی، حەسەن فەلاح: تابلۆی (شەڕی دەربەندی بازیان) دروست دەکات کە باسی شەڕی شێخ مەحموود و ئینگلیزەکان دەکات لە دەربەندی بازیان.

- بایەخدانی گۆڤاری ( ژین) و (کوردستان) لە ئەستەمبوڵ بە تەختیت و وێنە: بلاوکردنەوەی وێنەیەکی فۆتۆگرافی (شەریف پاشا) و (ابراهیم الحیدری) و تابلۆیەکی (صلاح الدین الایوبی).

سالانی (١٩٢٠)

- ژیانێکی ساکار و سادەی وێنەکێشانی هاوچەرخ: بەکارهێنانی خامە و خەڵووز.

لە سالانی (١٩٢٠)دا، کابرایەکی ئەرمەنیی رەسسام، جابیر پیرداود دەڵێ: " لە کۆتایی سالانی بیستەکاندا لە هەولێر هەبوو، رەسامێکی زۆر گەورە بوو، مامۆستا بووە لە رەسمکردندا. نیگاری دەکێشا و دەیفرۆشتە دەولەمەند و خاوەن قاوەخانە و چاپخانەکان، هەر بەو پارەیەش دەژیا" . مامۆستا سلێمان شاکر دەڵێ (کوردی ئەودیو بووە و ناوی جیهانگیر بووە. دیمەنی سروشتی کوردستان و جوانی کوردەواریی دەکرد. هەروەها پرۆپاگاندەی تایە و کەردەستەی ئۆتۆمبیلی لەسەر دیواری گەراجەکە رەسم دەکرد). لە سالی (١٩٣١) لە نزیک چاپخانەی عەبۆ لەناو گەراجەکەی جەلال عەبدۆکدا خۆی کوشت: خۆی بە پەت خنکاند. " دانیال قەصابی هونەرمەند، لە هەمان ئەو سالانەدا، لەژێر تەئسیری ئەودا هاتە مەیدانی هونەر". دیسان لە سەرەتای سالانی (١٩٢٠)دا رەسسامێکی دیکە لە هەولێر کاری کردووە بە ناوی ئیسحاق هەولێری.

(٢١ - ١٩٢٢)

- عەزیز سەلیم لە کەلار، بە خەڵووز لەسەر دیواری ماڵ و مزگەوتەکاندا رەسمی کردووە. باوکی، مامۆستای بۆ گرتووە و فێری رەسمی کردووە. ناوی مامۆستاکەی: عەلی فاتحی الکاظمی بووە. لە سەرەتادا زۆر رەسمی گیانەوەرانی کێشاوە: ئەسپ و پشیلە و مەڕ و مالات.

(١٩٢٥)

- تابلۆ و تەختیتەکانی حوسێن حوزنی موکریانی. ناوبراو یەکەم نووسەری کوردی هاوچەرخە، کە کتێبی خۆی بە تەختیت و نیگار رازاندبێتەوە: (غنچە بهارستان) زیاتر لە (٢٠) تابلۆی تێدایە. سەرهەڵدانی گرافیک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو.

(١٩٢٦)

- شێخ نووری شێخ سالح، لە ژمارە (٢١) و (٢٤)ی رۆژنامەی ( ژیان) لە سلێمانی بۆ

یەکەم جار لە وتارێکدا تەنزیرات لەبارەی هونەری نیگارکێشان بلاودەکاتەوە و دەیەوێ ئێستاتیکای شێوەکاری بلاوبکاتەوە. لەم بارەیەوە بنچینەی داهێنانی نیگارکێشی دەگەڕێنێتەوە بۆ بەهرە و دەسڕەنگینیی نیگارکێشەکە خۆی، نەک بۆ سروشت و دنیای دەرەوە: "ئەوەی لە رۆحی ئێمەدا حەضێکی بەدیعی حاصل بکا ئەوەیە کە لە دەستی مهارەتێک و صنعەتکارێک دەربچێ؛ یەعنی هەموو وەقتێک ئەوەی کە هەیەجانێک بۆ ئێمە حاصل ئەکا رەسم و مۆسیقا نیە بەڵکو ئەو صنعەت و مهارەتەیە کە قیمەت ئەدا بەمانە . هەروەها لەبارەی پێوەندیی ئەدەب بە نیگار و رەسمیشەوە دەڵێ: ئەو تەئسیرەی کە لە قصەیەکی جوان بۆمان حاصل ئەبێ لەگەڵ چاوپێکەوتنی لەوحەیەک و بینایەکی جوان و گوێ لە مۆسیقاگرتنێکی خۆش عەینی تەئسیرە.

نووسەر لەم بەرهەمەیدا هەموو بەشەکانی هونەرە جوانەکان "صەنایعی نەفیسە" شیدەکاتەوە و باس لە هونەری نەققاشی و شێوەکاریش دەکات.

- لە (١٩٢٦) کە بڕیاردرا بۆئەوەی خوێندن بە کوردی بخوێنری، لە هەولێر ناوی (لیجنەی فەن و تەمسیل) بووە (لیجنەی فنوونی جەمیلە). ئەم لیژنەیە لە کۆتایی بیستەکاندا و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند.

(١٩٢٧)

مەحموود شەوقی، باوکی ئازاد شەوقی، لە سلێمانی، کاریکاتێر و رەسمی کردووە.

(١٩٢٨)

یەکەم وتاری تەرخانکراو بە زمانی کوردی لەبارەی رەسم لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانی کە ویستوویەتی رۆشنبیرییەکی شێوەکاری بە زمانی کوردی بلاوبکاتەوە. لە ژمارە ( ٣)ی زاری کرمانجی دا، وتارێکی لەبارەی هونەری (گراڤوور) و رەسمکردن بەشێوەی کۆڵین بە ناونیشانی ( عەکاسیی کۆڵان) نووسیوە و ئەم زاراوە تازانەی بۆ یەکەم جار لە زمانی کوردیدا بەکارهێناوە: رەسمی نەضەری، مصەوەری مەشهوور، عەکس، صنعەتی چاپ و کلێشە، چینکۆگرافی، لیتۆگرافی، فۆتۆگراف.

هەروەها لە لاپەڕە ١٦ی ژمارە (١٢)ی هەمان گۆڤاردا موکریانی پڕۆپاگاندەی بۆ پەڕتووکی وێنەداری (ترازان) کردووە (بە مناسەبەتی هەر سەربهووردێ رەسمێکی تێدایە). لە هەمان شوێندا پڕۆپاگاندەی بۆ پەڕتووکی وێنەداری (خیوەی رازان) کردووە، لە طەرەف میرزا حەمەن کوردستانی تەرجەمە کراوە.

(١٧ی ئۆگستی ١٩٢٩)

موکریانی لە ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری زاری کرمانجیدا، لە وتاری (مێژووی عەکاسی و فرووعاتی) دا بایەخدانی کوردان بە هونەری رەسم و نیگارکێشان لە سەردەمی پێش ئیسلامدا روون دەکاتەوە.

**سالانی (۱۹۳۰)**

- لە ساڵی ۱۹۳۰و ۱۹۳۱دا حکوومەتی عیراق یەکەمین شاندی قوتابیانی عیراقی دەنێرێت بۆ ئەورووپا بۆ خوێندنی هونەری شێوەکاری مۆدێرن،: ئەکرەم شوکری و حافظ الدروبی بۆ بریتانیا و فائق حەسەن بۆ پاریس. هەر لەو ماوەیەشدا نەسلێکی گەنجی عیراقی دەکەونە کاری شێوەکاریی مۆدێرن: جەواد سلیم کە لە ۱۹۳۸ چووە پاریس و ئیتالیا و دووای خوێندنی پەیکەرتاشی، لە ۱۹٤٦ گەڕایەوە بەغدا. هەروەها محمد صالح زکی، عاصم حافظ، عەتا صبری، نووری مستەفا بەهجەت، جەمیل حەموودی، اسماعیل الشیخلی، خالد الچادر، فرج عبو کە زۆربەیان لە پەیانگەکانی ئەورووپا خوێندبوویان و بوونە مامۆستای قوتابیە هونەرمەندە کوردەکانی سالانی ۱۹۵۰ و کاریان کردە سەریان.

- شێخ نووری شێخ سالح، زاراوەی مصەوڕ بۆ نیگارکێش و زاراوەی ڕەسم بۆ نیگار و تابلۆ بەکاردەهێنێت و پایەی بەرزی نیگارکێش لە کۆمەڵگەدا دەردەخات:

مصەوڕێ کە لە دارالفنوونی قودرەتی حەق
بە فرطی عیلمەوە مەئزوونە بۆ تەزینی جیهان
صەحائفی هەمە ڕەنگی جیهانی بە دەستەوە، وا
خەریکی ڕەسمە، فەقەت ڕەسمی عالەمی ئیمکان.

- پەلوپۆ هاوێشتن بۆ ڕەنگ، بەکارهێنانی فایەر و کوتاڵ و ڕۆن و تێکەڵکردنی کەرەستان: دوورکەوتنەوە لە خامە و خەڵووز.

- تەختیتی ناو کتێبەکانی حوسێن حوزنی موکریانی: (خۆشی و ترشی)، (مەڕۆکە و بزنۆکە)، (چیرۆکی کەڵەباب) لە سالانی ۱۹۳۰، کە پڕن لە وێنە و تابلۆ و هێڵکاری و وێنەی روونکاری.

کەواتە لە (۱۹۰۰ ـ ۱۹۳۰)دا جموجۆڵێکی شێوەکاریی هاوچەرخ لە کوردستان هەبووە، نیشانەکانی، ئەمانە بوون:

۱ـ ژیانێکی ساکار و شێوازێکی سادەی هەبووە

۲ـ بەکارهێنانی خامە و خەڵووز.

۳ـ زیاتر نەقل کردن بووە. فۆتۆگراف یان تابلۆ جیهانییەکانیان گواستۆتەوە.

٤ـ ژمارەی نیگارکێشەکان زۆر کەمە: تەنیا ۲ یان ۳ هونەرمەند ناویان ماوە.

۵ـ هیچ شوێنەوار و بەرهەمێکی ئەوتۆی ئەو سالانە نەپارێزراون. زۆربەیان فەوتاون.

٦ـ ڕۆشنبیرییەکی سادەی شێوەکاری، لەڕێگەی چاپەمەنییەوە، لە کوردستان ربە زمانی کوردی بڵاودەبێتەوە.

۷ـ کەلوپەلی ڕەسمکردن لە شۆریجەی کەرکووک و بەغداوە دەهات بۆ هەولێر و سلێمانی، چونکە دەست نەدەکەوتن.

## ساڵانی ١٩٣٢ ـ ١٩٥٨
## قۆناغی یەکەمین پێشانگاکان

مامۆستای هونەرمەند، محەممەد عارف، لە چاوپێکەوتنێکیدا لە گۆڤاری رامان، ژمارە ٧، کانوونی دووەمی ١٩٩٧، لە لاپەرە ٣٩ ـ ٤٥دا دەڵێ: «لە سەرەتای پەنجاکاندا هیچ کەش و هەوایەکی هونەریی راستەقینە لە هەولێر نەبووە، جگە لە ئاراستەکردنی چەند مامۆستایەکی هونەرپەروەر نەبێ کە خاوەن فەزڵێ لەسەرمان».

بەپێچەوانەی ئەمەشەوە دەردەکەوێت: لە ماوەی ساڵانی (١٩٣٦ ـ ١٩٥٨)دا، جموجۆڵی شێوەکاریی هاوچەرخ لە کوردستاندا گەیشتۆتە قۆناغی پێگەیشتن و فراژووبوون. نیشانەکانیشی، ئەمانە بوون:

١ـ پەلوپۆ هاویشتن بۆ رەنگ، بەکارهێنانی فایبەر و کوتاڵ و رۆن و تێکەڵکردنی کەرەستان؛ دوورکەوتنەوە لە خامە و خەڵووز.

٢ـ وردە وردە دوورکەوتنەوە لە نەقل کردن، رووکردنە داهێنان.

٣ـ ژمارەی نیگارکێشەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات: دانیال قەصاب و جەواد رەسوول ناجی رێبەرایەتیی ئەم جموجۆڵە دەکەن.

٤ـ لە ساڵی ١٩٥٢ بەولاوە هونەرمەندانی نیگارکێشی کورد، بەتایبەتی لە هەولێر و سلێمانییەوە، دەچنە پایتەخت و بەشێوەیەکی ئەکادیمی هونەری نیگارکێشی دەخوێنن.

٥ـ ژمارەیەک لە شوێنەوار و بەرهەمی نیگارکێشەکانی ئەو ساڵانە پارێزراون، دەبنە بەڵگەی سەلماندنی ئەو پێگەیشتنە هونەرییە.

٦ـ تابلۆ لە سەردیواری چایخانە و دیوەخان و ماڵە ئاغاکانەوە دەچێتە ناو خەڵک: بۆ یەکەم جار، هەر لە ساڵانی ١٩٣٠ بەولاوە، لە پێشانگاکاندا پیشانی جەماوەر دەدرێن.

٧ـ رەنگدانەوەی کاریگەرێتیی شێواز و رێبازە هاوچەرخەکانی ئەورووپا، بەتایبەتی بەسەر بەرهەمەکانی دانیال قەصاب و عەزیز سەلیم و ئەنوەر تووفی و خالد سەعید.

**(١٩٣٢)**

– یەکەم پێشانگای هونەری رەسم لە سلێمانی: عەزیز سەلیم یەکەم پێشانگەی تایبەتی خۆی لە قەبرستانی شێخ جەعفەر کردۆتەوە (لەبەرئەوەی نەیانهێشتبوو لە قوتابخانە و هۆڵەکاندا بیکاتەوە). تابلۆکانی، کە بریتی بوون لە (١٢) تابلۆ، بە قەد کێلەکانەوە هەڵپەساردبوون. پاشان خەڵک تابلۆکانیان دڕاندبوو، ئەویشیان بەردباران کردبوو.

– حەسەن فەلاح، ئەو کاتە تەمەنی بیست و دوو ساڵ بووە و لە گەرمەی رەسمکردندا بووە. لەسەر دیواری ماڵ و چایخانە و دیواری ناوبازاڕەکان رەسمی دەکرد (لە سلێمانی و لە بەغدا).

هەروەها گەلێک تابلۆی هەبوون لەسەر دیواری ئەو هوتێلانەی کە لە بەغدا تێیدا دەژیا.
- لە هەولێر (لیجنەی فەن و تەمسیل) بووە (لیجنەی فنوونی جەمیلە). ئەم لیژنەیە لە کۆتایی بیستەکاندا و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند. لە هەمان کاتدا، ئەم لیژنەیە لە (١٩٣٢ - ١٩٣٣)دا لە سانەویی هەولێر، توانی بۆ خۆی ژوورێک تەرخان بکات و مەرسەمێکی قشت (ستۆدیۆی رەسم) بۆ یەکەمین جار لە شاری هەولێر دابمەزرێنێ.

(١٩٣٢ - ١٩٣٤)

- حەسەن فەلاح لەگەڵ عەزیز سەلیم، لە سلێمانی، لەسەر دیواری قاوەخانەکانی ئەسحابە سپی (لە جادەی کاوەی ئێستا) تابلۆ و پۆرتریت دروست دەکەن. عادەتەن لە چایخانەی رەشۆل بەیەک دەگەیشتن. ئەوکاتە مندالکارە و گەنجی رەسسام هەبوونە، حەسەن فەلاح و عەزیز سەلیم هانیان داون بۆ رەسم. کەلوپەلی رەسمیان لە شۆریجەی کەرکووک و بەغدا بۆ کڕیون و داویانە پێیان.

(١٩٣٤)

- دانیال قەصاب، لە هەولێر، لەسەر زمانی جابیر پیرداودەوە: لای سینەما سەلاحەدین، گەلەرییەکی نیگارکێشی دەکاتەوە. ئەمە دەبێتە دووەم مەرسەم لە هەولێر.
- دووەم پیشانگای عەزیز سەلیم لە قوتابخانەی گەلاوێژ لە سلێمانی. دیسان خەلک نەیانهێشتووە بەردەوام بێت.
- سێیەم پیشانگای عەزیز سەلیم لە شاری کەرکووک، لە گەڕەکی شۆریجە، لە چایخانەی یداللە کردۆتەوە. بریتی بووە لە (٦) تابلۆ. هەندی لە تابلۆکان فەرمانبەرانی شەریکەی نەوتی کەرکووک لێیان کڕیوەتەوە بە (٤ و ٦ و ١٠) دینار. هەر لەوێ، ئیبراهیم خەلیلی رەسسام دەناسێت.

(٥ای کانوونی یەکەمی ١٩٣٤)

حسێن حوزنی موکریانی، لە چاپخانەی زاری کرمانجی (زنجیرەی ژمارە ٢٠) لە رواندز یەکەم کتێبی سەربەخۆی بە زمانی کوردی لەبارەی هونەری گراڤوور و رەسمکردن و وێنەگەری بەناونیشانی (وێنەگەری و کۆلین) بلاوکردەوە. کتێبەکە، وێنەیەکی فۆتۆگرافیی نووسەر و (٢٥) تابلۆی تەختیتی تێدایە کە ئامێرەکانی نیگارکێشان و لیتۆگرافی و گراڤوور و زەنکۆگرافی و فۆتۆگرافی پیشان دەدات. ئەم تابلۆیانە دەسکردی حوسێن حوزنی - خۆین.

لە بواری زاراوەسازیشدا، هەموو ئەم زاراوانە، یەکەمین جارە دەکەونە ناو زمانی نووسینی کوردییەوە: وێنەگەری، زەنکۆگراف، فوتوغراف، ئالەتی نیگارکێشان، وێنەهەلقەندن، کۆلانی بە تیشک، فۆتۆگراڤیور، کۆلۆدیۆن، چوارچێوە، شووشەی بە هەست، ئاوەنگ، دەرمانی گیراوە، دووربین، فەنەر، نەخشە، رەحەتی، سانتیمەتر، غرام، ئەسپرتۆ، تواوە، تیرۆک، قەلەمی رتووش،

فلچە، کلێشەدان، رەندە، قالب وەرگرتن، بەتاریەی ئەلەکتریک، مەرەکەبی تەڕ، لیتۆگرافی.

(١٩٣٥)

- ئیبراهیم خەلیل، نیگارکێشێکی کوردی خەلکی دووزخورماتوو بووە و رەسمی کردووە، لە ناوەراستی سالانی ١٩٣٠دا لە کەرکووک هانی عەزیز سەلیمی داوە.

- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی هونەرمەندی کورد، فاروق عەبدولعەزیز (لەدایکبووی ١٩١١/٧/١) لە بەغدا. لە سالانی (١٩٤٠) و (١٩٥٠)دا دەورێکی گرنگ لە جموجۆلی شێوەکاریی عیراقدا لە بەغدا دەبینێ.

## یەکەمین پیشانگای هونەری رەسم لە شاری هەولێر

سالی (١٩٣٦) بە سالێکی گرنگ دەژمێردرێت لە مێژووی جموجۆلی هونەری شێوەکاریی شاری هەولێر:عەزیز سەلیم، حوسێن حوزنی موکریانی دەناسێت، ئەویش دەیناسێنێ بە دانیال قەصاب (ئەوکاتە مامۆستای قوتابخانەی ئیبن خولەکان بووە) لە هەولێر. لە هەمان سالدا، بە هاندان و پشتگیریی موکریانی، پیشانگایەکی هاوبەش لە بالکۆنەکەی قوتابخانەی ئیبن خولەکان دەکەنەوە. موکریانی - خۆی کارتی پرۆپاگاندەیان بۆ چاپ دەکات. عەزیز سەلیم بە (١٢) تابلۆ و (٢) نەحت بەشدار دەبێت و دانیال قەصاب بە چەند تابلۆیەک، یەک لەوانە منارەی چۆلی بووە. پیشانگاکە ٤ رۆژی خایاندووە. عەزیز سەلیم لەو تابلۆیانەدا، تراژیدیای ژیانی جوتیارانی پیشان دابوو. ئەم پیشانگایە بریتییە لە یەکەمین پیشانگای هونەری نیگار و وێنەکێشان لە شاری هەولێر.

سالانی (١٩٣٧ - ١٩٣٩)

- دانیال قەصاب مامۆستای رەسمە لە قوتابخانەی "اربیل اولی". لەوێ، جابیر پیرداود و جەواد رەسوول ناجی و فوئاد رەسوول ناجی، فێری رەسمکردن دەکات.

- لە هەولێر، لیجنەی فنوونی جەمیلە، کە سەر بە ئامادەیی هەولێر بوو، بە بەشداری و سەرپەرشتیی دانیال قەصاب، پیشانگەیەکی گشتیی رەسمی، لەناو قوتابخانەکەدا بۆ هونەرمەندانی شاری هەولێر کردەوە و زۆر تابلۆی نایابی خستە روو و جێگەی سەرسوڕمان بوو. هونەرمەندەکان خودی قوتابییان بوون کە ئەمانە بوون: منیر و ناخووم عوزێر قەصابی براکانی دانیال، سەلاحەدین مستەفای محامی، رەشید عەبدولقادر رەشید (کە ئێستا حاکمە لە هەولێر)، جەواد رەسوول ناجی، فوئاد رەسوول ناجی، عەبدوللا حوسێن کەسرە. تابلۆکان، هەم بە پاستیل و زەیتی، هەم بە قەلەمی رەژوو بوون. هەمووشیان راگوێزانی چەندین تابلۆی جیهانی بوون. یەکەم

وەرچەرخانی ئارەزووی ئەو کۆمەڵە خەڵکانە بوو بۆ هونەر. جابیر پیرداود، لە چاوپێکەوتنێکی (رامان، ژ ١٨) دا دەڵێ: ( ئەم پیشانگەیە لە ساڵی ١٩٣٧ - ١٩٣٨دا بووە).
- لە ١٩٣٩: کرانەوەی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە بەغدا.
١٩٤٠.
- دانیال قەصاب سەرپەرشتیی رازاندنەوەی چەند دیکۆرێکی شانۆی کردووە لە هەولێر، لەوانە: شانۆگەریی سەلاحەدینی ئەییووبی، هەروەها لە هەولێر و کۆیە و رواندز چەندین نیگار و وێنەی لەسەر دیوار و تەختەی سەر شانۆکاندا دروستکردووە.
- عەزیز سەلیم و حەسەن فەلاح لە سلێمانی، بەردەوامن: نیگاری دیواربەند لەسەر دیواری حەمام و چایخانە و ماڵەکاندا دروست دەکەن.
- منیر قەصاب یەکەم جار لە رواندز دادەمەزرێت، دەورێکی دیاری هەبوو لە پەرەپێدانی هونەری شێوەکاری لە رواندز لە سەرەتای ساڵانی (١٩٤٠). تابلۆی (منارەی چۆلی) رەسم دەکات کە پاشان ئەسکەندەر عوسمان لە ساڵانی ١٩٥٠ کۆپیی دەکات.
**١٤ تا ٢٤ ی تشرینی یەکەمی (١٩٤١)**
- دانیال قەصاب لە بەغدا پێوەندیی بە اصدقاء الفن دەکات. بە شایەدیی حمدی خلف و شاکر حسن ال سعید: لەگەڵ گرووپی اصدقاء الفن، واتە لەگەڵ اکرم شکری و جواد سلیم و عبدالقادر الرسام و عەتا صەبری (لەدایکبووی ١٩١٣ کەرکووک) و حافظ الدروبی و شوکت سلیمان و نزیهە سلیم و ناهدە الحیدری و نزار سلیم، لە قاعەی بینایەی جمعیە الهلال الاحمر لە بەغدا، بەشداریی کردووە لە یەکەم پیشانگەی هاوبەشی اصدقاء الفن کە بریتی بوو لە (٨٤) تابلۆی زەیتی و (١٦) تابلۆی ئاوی و (٣) تابلۆی پاستێل و ٥ تەختێیت و ١٤ پارچە نەحت و ١٧ کاریکاتۆر.
- حەسەن فەلاح چوو بۆ کوێت، لەوێ تابلۆی شەڕی یەرمووک و سەلاحەدینی ئەییووبی و دەرکەوتنی ئیسلامی کێشا، هەروەها پۆرترێتی بۆ شێخ صباح السالم الصباح دروست کرد. تا جەنگی دووەمی جیهانی لەوێ مایەوە.
**(١٩٤٢)**
- دەرکەوتنی تابلۆکانی جەواد رەسوول ناجی (١٩٢٢) و فوئاد رەسوول ناجی کە ئیشکردن بە چەقۆی داهێنا.
- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی قوتەیبە شێخ نووری ( لە ١٩٢٢ لەدایکبووە) لە بەغدا.
- دەرکەوتنی رەسم و پەیکەرەکانی شێخ جەمالەدین (١٩٢٣- ).
- دەرکەوتنی پەیکەر و تەختێیتەکانی جابیر پیرداود کە پاشان لە (١٩٤٣) لە بەشی پەیکەرتاشی لە خانەی مامۆستایانی بەغدا وەردەگیرێت.

(١٩٤٣)

- دانیال قەصاب لە بەغدا، بە شایەدیی شاکر حسن ال سعید: لەگەڵ گرووپی اصدقاء الفن، واتە لەگەڵ اکرم شکری و جواد سلیم و عطا صبری و حافظ الدروبی و فایق حسن و نزیهە سلیم و ناهدە الحیدری و عیسی حنا و جمیل حمودی و حمید المحل و خالد سلیمان الجادر و دیزی الامیر و رشاد حاتم و سلمان داود و عزالدین الصندوق، لە قاعەی المعهد الثقافی البریطانی لە بەغدا، بەشداریی کردووە لە پیشانگەی هاوبەشی ساڵانەی سێیەمی اصدقاء الفن.

- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی بەدیع حسێن باباجان ( لە ١٩٢٣ لە کەرکووک لەدایکبووە). لە سلێمانی بە قەڵەمی رەش رەسم دەکات و کار لە قوتابییانی وەک عومەر عەلی ئەمین دەکات.

- عەزیز سەلیم پیشانگایەکی هاوبەشی بۆ هونەرمەندانی کوردستانی ئێران کردۆتەوە لە شاری مهاباد. هەندێ لە هونەرمەندەکان: وەلی زادە (کرمەشان)، خەلیل زادە (مهاباد)، مەحموود مەحدوور (مامۆستا بووە و خەڵکی سنە بووە). خۆیشی بەشداریی کردووە.

- سەلام عادل ( حسێن ئەحمەد رەجەوی) لە (١٩٤٣) تا (١٩٤٦) لە دیوانیە مامۆستای رەسمی ئازاد شەوقی بووە لە قوتابخانەی ناوەندی.

(١٩٤٤)

- عەزیز سەلیم پیشانگایەکی هاوبەشی دووەمی بۆ هونەرمەندانی کوردستانی ئێران کردۆتەوە لە شاری باکۆ. بریتی بوون لە ١٠ - (١٢) هونەرمەند. خۆیشی بەشداریی کردووە.

- رەسم و تابلۆکانی زەکی بارۆخ، مۆسیقاژەن و رەسسامێکی جوولەکە، دوکانی رەسمی هەبووە لە هەولێر. هەروەها فوناد چەخماخچی، هەولێرییەکی تورکمانی رەسسام بووە و دوکانی رەسمی هەبووە.

(١٩٤٥ - ١٩٤٦)

- دانیال قەصاب پێشانگەیەکی تابلۆ و ئەحتی لە کۆیە کردۆتەوە: تابلۆیەکی مۆریللۆی ئیسپانیی نەقل کردبوو و گۆڕیبووی بە "کرێکارێک بە جلی کوردییەوە". لە هەمان کاتدا سێ تابلۆ ناودارەکەی ئاغا دزەییەکەی گوندی عوێنەی و منارەی چۆلی و دەرگای قەڵا دروست دەکات کە ئەمڕۆ دووانەکەی ئەخیر لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر پارێزراون.

- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی خەسرۆ جامباز لە هەولێر.

- جەمال فەرەج، بە رای ئازاد شەوقی، نیگارکێشێکی مەسیحیی خەڵکی هەولێر بووە، ئەندازیار بوو، لە بەغدا دەژیا. لە ساڵانی چلەکان بە شێرپەنجەی خوێن مرد. کە مرد، فایەق حەسەن و ئیسماعیل شێخلی و جەواد سەلیم لە یادی یەکەمی مردنیدا پێشانگەیەکیان بۆی کردەوە و ئەختیتەکانیان پیشان دا، گەلێک تابلۆی لەبارەی هەولێر و کوردەواری هەبووە.

- جەمال حامد ئەسعەد ( بەختیار ) لە ١٩٤٦، کە لە حیزبی هیوا کاری دەکرد، لە مهاباد وێنەیەکی سەلاحەدینی ئەیبووبی و قازی محەممەد بە قەڵەمی خەڵووز دروست دەکات. مەلا

مستەفای بارزانی وێنەکەی بە دڵ دەبێت و جەمال بەختیار لەگەڵ خۆی دەبات بۆ لای قازی محەمەد، هەر ئەویش ئازناوی بەختیاری دەداتێ.
- جابیر پیرداود لە کۆیە تەعین دەبێت و دەرسی رەسم دەڵێتەوە و دەکەوێتە کارکردن لە بواری رەسم و پەیکەرتاشیدا و چەندین قوتابی رەسم و هونەرمەندیش پێدەگەیەنێ.
- عەزیز سەلیم لە کۆماری مهاباددا لە وەزارەتی عیلاقاتی خاریجی و فەرهەنگ کاری کردووە. لەگەڵ قازی محەممەد و عبدالرحمن زەبیحی برەویان بە ژیانی رەسم و هونەری داوە.
• لە مانگی حەوت: پیشاندانی شانۆنامەی لە رێی نیشتیماندا، رەفیق چالاک کردبووی بە کوردی و دەوری تێدا دیوە. دیکۆرەکەی، حەسەن فەلاح کردوویەتی.

(١٩٤٧)

- دەرکەوتنی تابلۆکانی شێخ مستەفا بەرزنجی لە سلێمانی. ناوبراو کە دەرسی رەسمی دەوتەوە لە قوتابخانەی فەیسەلیە، دوای حەسەن فەلاح و خالید سەعید، یەکێکە لە پێشرەوەکان، بە بۆیەی زەیتی کاری دەکرد، بالندە و ئاژەلیشی مۆمیا دەکرد. دووای ئەو بوو کە تەختیت و تابلۆکانی ئازاد شەوقی و قادر کوردی و عومەر عەلی ئەمین لە سلێمانی دەرکەوتن.
- فارووق عەبدولعەزیز پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا تەواو دەکات و لە بەغدا دەست بە رەسم و چالاکیی شێوەکاری دەکات.
- لە مانگی بەهاردا لە قوتابخانەی ناوەندیی کچانی سلێمانی، لە نزیک مزگەوتی گەورە، بە بەشداریی شێخ مستەفا بەرزنجی و عومەر عەلی ئەمین و بە سەرپەرشتیی چالاکیی هونەریی قوتابخانەکان، پیشانگەیەکی فراوانی قوتابیان.
- خانەی مامۆستایانی لادێی دهۆک و هەولێر کرایەوە، لە (١٩٤٨) کرانە یەک و بنکەکەی چووە دهۆک و لەوێ بە سەرۆکایەتیی هونەرمەندی دەرهێنەر عزالدین علی الجراح تیپێکی شانۆییمان دامەزراند. بۆ هەر پەردەیەک دیکۆر دەکرا. دارا رەئووف قەزاز کەرکووکی لە هونەری تەشکیلیدا بەهرەدار بوو، دیمەنی دیکۆرەکانی لەسەر قوماش رەسم دەکرد.

(١٩٤٨)

- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی جەمال حامد ئەسعەد ( بەختیار ).
- جەواد رەسوول ناجی، کە ماڵەکەیان (لەگەڵ هەر دوو براکەی: حەسیب و فوئاد) لە گەڕەکی عەرەبان بووە لە هەولێر، مەرسەمێکی گەورەی لە ماڵەوە هەبووە. ئەم هونەرمەندانەی خوارەوە لە مەرسەمەکەی ئەودا ئیشیان کردووە: جابیر پیرداود، تاهیر پیرداود، ئەدوەرد ولیەم، فوئاد رەسول ناجی، جەلال مەدحەت خۆشناو، سوداد و موراد عەتاولاغا، ئەدوارد سەلیم، حەسیب رەسوول ناجی، هەروەها دەرهێنەر ئەسکەندەر عوسمان.

- دانیال قەصاب لە هەولێرەوە چووە بۆ بەغدا و بووەتە مامۆستای پەیانگای هونەرە جوانەکان. لەوێ دیکۆری فیلمی " علیا و عصام"ی دروستکردووە.

(١٩٤٩)

- حەسەن فەلاح لە تاران لە ژووری هوتێلێک دەژی: لەوێ وێنەی پرۆپاگەندەی دەکێشا و دیمەنی سروشتی دەکرد و خەتخۆشیشی دەکرد. لە چایخانەکانیشدا رەسمی رۆستەم و زۆراب و شیرین و فەرهاد و تیمامی عەلیی دەکرد. - ئازاد شەوقی لە کەرکوک لەگەڵ مەحموود عوبێدی و د. سنان سەعید پیشانگەیەکی هاوبەشیان کردۆتەوە.

- عەزیز سەلیم لە تورکیاوە بەرەو ئەورووپا سەرهەڵدەگرێت، شەش مانگ لە پاریس دەمێنێتەوە (لەوێ پیکاسۆ دەناسێت). لە ئەورووپا ئاشنایەتی لەگەڵ قوتابخانە تازەکانی ئەورووپا وەک کوبیزم و سوریالیزم پەیدا دەکا. لە زستانی ١٩٤٩ لە پاریس، لە هوتێلێک بە (٣٦) تابلۆ پیشانگایەک دەکاتەوە و (١٠) رۆژ بەردەوام دەبێت.

- جەواد رەسوول ناجی، کە مامۆستای وێنەکێشانی سلێمان شاکرە و لە لیژنەی هونەریی رەسم دا بووە لە قوتابخانەی دواناوەندیی هەولێر، سەرپەرشتیی رەسمکردنی قوتابیان و کردنەوەی پیشانگە و چالاکییە هونەرییەکانی کردووە،

(١٩٤٩ - ١٩٥٠)

- جابیر پیرداود لە کۆیە پیشانگای کردۆتەوە و نەقلی دیلاکروای کردووە.

- کۆمەڵێک قوتابی (مستەفا عوزێری و حاکم رەشید قادر) لە کۆیە پیشانگایەکی رەسمی کوردییان ساز کردووە.

- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی عوسمان مستەفا خاڵ ( لەدایکبووی ١٩٢٥) لە سلێمانی.

- جەمال بەختیار، کە تەئسیری گۆرانی شاعیری زۆر لەسەر بوو، لە هەولێر دەوری هەبووە: رەسمی ئوم کەلسووم و عبدالوهاب و ئەسمەهانی کۆپی دەکرد و بە دیوارەکانی چایخانەی حەسەن رەزا ( مەچکۆی ئێستا ) هەڵیدەواسین.

(١٩٥٠)

- خالد سەعید پیشانگەیەک لە سلێمانی و کەرکووک دەکاتەوە، کە بەشی زۆری تابلۆکان بریتی بوون لە وێنەی ژیانی کوردەواری و بەشێکیشیان ژیانی ئەورووپا. ناوبراو لە شەقامی مەولەوی (مەرسەمێکی ) هەبوو.

- جابیر پیرداود لە قوتابخانەی نوولای هەولێر دادەمەزرێت و دەرسی رەسم دەڵێتەوە.

- دانیال قەصاب لە سەرەتای سالانی (١٩٥٠) جاربەجار لە بەغداوە سەری لە هەولێر

داوەتەوە.
- لە (٧/ ١٩٥٠) پیشاندانی شانۆنامەی هاملێت نووسراوی شکسپیر، ئامادەکردن و دەرهێنانی: مەجید رشید، لەلایەن قوتابیانی سەر بە پەروەردەی سلێمانی لە هۆڵی سانەویی سلێمانی. دیکۆری خالید سەعید.

(١٩٥١)

-. دانیال قەصاب، لەگەڵ جواد سلیم و فایەق حسن و شاکر حسن ال سعید و محمود صبری، بەشداری دەکات لە دامەزراندنی جماعە بغداد للفن الحدیث، کە پیشانگەی یەکەمیان لە هۆڵی (متحف الازیاء) کردەوە. حمدی خلف دەڵێ: تابلۆی دانیالیشی تێدا بووە. هەروەها هەندێ لە ئەندامەکانی دیکەیش لەو گرووپەدا هونەرمەندی کوردی شاری کەرکووک بوون، لەوانە: عەتا سەبری.
- یەکەم قوتابیی کورد، بەدیع حسێن باباجان، لە ١٩٥١ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا تەواو دەکات.
- دەرکەوتنی پەیکەرە بچووک و تابلۆکانی سەردار زوهدی لە سلێمانی، کە تەنسیری ئازاد شەوقی و قادر کوردییان لەسەر بووە.

(١٩٥٢)

- خالید سەعید: یەکەم پیشانگای تایبەتی خۆی کردەوە لە هۆڵی مەکتەبەی عامەی هەولێر کە ئەو کاتە کەوتبووە سەر ڕێی مووسڵ. سلێمان شاکر دەڵێ: ئەم پیشانگەیە فتیلێکی هەڵگیرساند. (تابلۆکانیشی تێکەڵ بوون لەنێوان نەقل و نمایشی فۆتۆگرافی و ئەفراندنی خۆی).

(١٩٥٣)

- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی د. عەبدوللا ئەمین مەلا (لەدایکبووی ١٩٣٣ - چەمچەماڵ) لە چەمچەماڵ و کەرکووک. هەر ئەو ساڵە قوتابخانەی مامۆستایانی لادێی دهۆک تەواو دەکات، لە چەمچەماڵ تەعین دەبێت و چەند پیشانگەیەک لە چەمچەماڵ و کەرکووک دەکاتەوە. پاشانیش دەبێتە مامۆستای رەسم لە ناوەندیی کەرکووک. لەگەڵ دوو هونەرمەندی دیکەی کوردی کەرکووک (محەمەد مەهدی و صدیق ئەحمەد عاشوور) دەوری دەبێت لە دامەزراندنی جماعە فنانی کرکوک و چەندین پیشانگەیان لەگەڵ دەکاتەوە لە کەرکووک لە ماوەی (١٩٥٤ - ١٩٦٠)دا.
- دامەزراندنی جماعە فنانی کرکوک لە کەرکووک، کە بەشی زۆریان کورد بوون، لەوانە: د. عەبدوللا ئەمین مەلا، محەمەد مەهدی، صدیق ئەحمەد عاشوور. پیشانگەی یەکەمیان لەناو بینایەی ( غازی الابتدائیە) دەکەنەوە، کە تەنیا ئەمانە بەشداری دەکەن: محمود العبیدی (

تورکمان)، صدیق ئەحمەد عاشوور ( کوردی مووسل)، سنان سعید.
- لووتکەی چالاکی و بەرهەمەکانی صدیق ئەحمەد عاشوور (لەدایکبووی مووسل ١٩١٥)، ئەندامی دامەزرێنی کۆمەڵەی هونەرمەندانی کەرکووکە و لە هەموو پیشانگاکانیاندا تا (١٩٦٠) بەشداربووە. ئازاد شەوقی لەبارەیەوە دەڵێ: " زۆربەی ژیانی لە کەرکووک بردۆتە سەر، زابط تەجنید بووە لە کەرکووک. بە تەواوەتی کوردیی دەزانی و کوردی زۆر خۆش دەویست. دۆستێکی نزیکی من و هاوڕێ نیگارکێشە کوردەکان بوو. تابلۆی نیشتیمانی و پێشکەوتنخوازانەی ڕەسم دەکرد. لەگەڵ من پێکەوە لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتاکانی شەستەکان دەهاتینە سلێمانی، پێکەوە دانیشتووین ڕەسمی سەرچنارمان کردووە. زیاتر لە ٩ تابلۆی کوردستانی لە مۆزەخانەی بەغدا پارێزراوە".
- جەواد ڕەسوول ناجی، مامۆستای سلێمان شاکر و محەمەد عارف و سوداد عەتاولاغا و مراد عەتاولاغا و جەلال خۆشناو و ئەسکەندەر عوسمان لە ئامادەیی هەولێری جێی محافەزەی ئێستا، دەرسی ڕەسم و هونەرە دەستییەکانی دەدایەوە. لە ١٩٥٣دا سەرپەرشتیی پێشانگەیەکی گەورەی قوتابییانی کرد، کە یەکەم پیشانگەی هاوبەشی قوتابییانی بووە لە هەولێر و مدیریەتی مەعاریف سازی داوە. یەک هەفتە درێژەی کێشاوە، لە مەدرەسەی خەنسای ئێستا، لەم پێشانگەیەدا بەرهەمی قوتابییانی دەرەوەی هەولێریش پیشان دراون، کاری نەقلکراو، بەرهەمی قوتابییان: ئەدوەرد ولیەم، سلێمان شاکر، جەلال مەدحەت خۆشناو، سوداد عەتاولاغا و مراد عەتاولاغا. فوئاد ڕەسوول ناجی و خاتوو پیرۆز ئەمین ـ کە دەبێتە یەکەم هونەرمەندی وێنەکێشی ئافرەتی کورد ـ لە ڕواندزەوە هاتبوون و بەشدارییان کرد.
لەم پیشانگایە بەدووا نیتر کردنەوەی پیشانگەی ڕەسم لە هەولێر بووە عادەت. مدیر تەربیەی ئەوسات عبدالمجید حسن بوو. ئەم پیشانگەیە، بە بۆچوونی سلێمان شاکر:( میهرەجانێکی هونەری شێوەکاریی نوێ بوو. خەڵکەکە پێ سەرسام بوون. هەرچەند ئەو تابلۆیانەی کرابوون، هەمووی نەقل بوون لەسەر تابلۆی هونەرمەندان و فۆتۆگرافەکان و ئیشی دەستی و دروومانیشیان تێدا بوو).
- یەکەم دوو قوتابی لە هەولێرەوە، سلێمان شاکر و ئەدوەرد ولیەم، دەچن لە بەشی ڕەسم لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا بخوێنن.
- یەکەم دوو قوتابی لە سلێمانییەوە، ئازاد شەوقی و خالید سەعید، لە بەشی ڕەسم لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەردەگیرێن. ( ولیەم یوحەننا لە بەشی مۆسیقا). عەتا سەبری، لەگەڵ فایەق حەسەن و فەرەج عەبو و جەواد سەلیم و اسماعیل الشیخلی دەرسیان پێ دەڵێنەوە و دەرەنگتر ناو لە تابلۆ تایبەتییەکانی ئازاد شەوقی دەنێن ئازادییات.
- دەرکەوتنی ڕەسم و تابلۆکانی کەریم دیار لە هەولێر.

**شوباتی ١٩٥٤**

- بە پێشنیاری ئازاد شەوقی، بە سەرپەرشتیی مامۆستا فایەق حەسەن، نیگارکێشەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا، بەتایبەتی کوردەکان ( ئەدوەرد ولیەم و سلێمان شاکر) لەگەڵ میران السعدی، لە بەغداوە گەشتێکی (٢٤) رۆژی بەرەو شەقلاوە و رواندز و دیانە و حاجی ئۆمەران و رایات و حەریر و باتاس دەکەن بۆ رەسمکردنی دیمەنەکانی کوردستان. ئازاد شەوقی دەڵێ: دەعوەتم کردن بۆ سلێمانی و هەولێر. تەنیا فایەق حەسەن لە ماوەی ئەو بیست و چوار رۆژەدا زیاتر لە (٨) تابلۆی رەسم کرد. لە هەولێر، بەڕێوەبەری ئامادەیی هەولێر، عوسمان قۆجە قەصاب و جابیر پیرداود و جەواد رەسوول ناجی میوانداریان کردین. جەواد رەسوول ناجی تا حاجی ئۆمەران لەگەڵمان هات. ئامانجمان لەم سەفەرە ئەوە بوو کە کوردستان رەسم بکەین و پیشانگەیەکی تایبەتیی بۆ بکەینەوە.

- لە پەیمانگەی هونەریی بەغدا پیشانگەیەکی تایبەت بە کوردستان کرایەوە کە تابلۆکان هەمووی لەبارەی کوردستان بوون: بە زەیتی بوون لەو تابلۆیانەی کە ئازاد شەوقی و فایەق حەسەن و ئەدوەرد ولیەم و سلێمان شاکر و میران السعدی لە گەشتەکەی شوباتی (١٩٥٤)دا لە کوردستان دروستیان کردبوو. قوتابییەکانی باشوور و بەغدا سروشتی رەنگینی کوردستانیان نەدیبوو. دووای ئەم پیشانگەیە عەشقێکی زۆریان بەرامبەر کوردستان و خەڵکی کورد پەیداکرد.

- محەممەد عارف لە بەشی رەسم لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەردەگیرێت.

- دووای راپەڕینی ساڵی (١٩٥٣) فەسڵکردنی قوتابییە کوردەکانی پەیمانگای شێوەکاریی بەغدا (سلێمان شاکر و خالد سەعید ) دەستی پێکرد. خاوەنی چاپخانەی عەبباس ( گرامافۆنی لێ بووە) تابلۆی لە سلێمان شاکر کڕیوە.

- پیشانگەی دووەم و سێیەمی جماعە فنانی کرکوک لە کەرکووک، کە بەشی زۆریان کورد بوون، لەوانە: د. عەبدوللا ئەمین مەلا، محەممەد مەهدی، صدیق ئەحمەد عاشوور. هەروەها عزالدین الصندوق، محمود العبیدی، هاشم اسماعیل الموصلی، سنان سعید، لە هۆڵی کتێبخانەی گشتیی کۆن.( جماعە فنانی کرکوک) تا ساڵی (١٩٦٠) یازدە پیشانگەیان کردەوە و چەندین پەیکەریان لە شاری کەرکووکدا دروستکرد.

- پیشانگای کشتوکاڵی و پیشەسازی لە سلێمانی، کە میهرەجانی هونەری رەسم و هونەری دەستی بوو بۆ ماوەی ٧ رۆژ، بە ئامادەبوونی موتەسەریفی سلێمانی. زۆربەی هونەرمەندان و مامۆستایانی رەسمی سلێمانی بەشداربوونە.

- شەمسەددین فارس لە بەشی رەسم لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەردەگیرێت.

- پەیکەر و تەختیتەکانی قەدری حەیران دهۆکی، کە پەیکەرتاش بووە و لە دەورەی سلێمان شاکر بووە.

(١٩٥٥)

- عوسمان مستەفا خاڵ لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەردەگیرێت و لە (١٩٥٩) تەواوی دەکات.

- لە ٢١/١١/١٩٥٥ ئازاد شەوقی کە دەگەڕێتەوە سلێمانی، لە ناوەندیی سلێمانی، دەرسی رەسم دەڵێتەوە.
- لە ٢٧ی تشرینی دووەم تا ٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥ عەتا صەبری، بە هاوکاری لەگەڵ نیگارکێشی بریتانی، نار. رۆس تۆماس، دووای سەفەرێکی هونەریی رەسمکردنیان لە باوەشی سروشتی کوردستاندا، پیشانگەیەک لە هۆڵی (المدرسه التاسیسیه) لە سەعدوون - لە بەغدا دەکەنەوە.

(١٩٥٥ - ١٩٥٦)

- خالد سەعید پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا تەواو دەکات، بەشی وێنەکێشان. پاشان بۆتە مامۆستای هونەر لە قوتابخانەکانی سلێمانی بۆ ماوەی دوو ساڵ. چەندین دیکۆری بۆ چەندین شانۆگەری لە سلێمانی، هەروەها بۆ شانۆگەرییە کوردییەکانی تەلەفزیۆنی کەرکووک و بەغدا دروست کردووە.
- حەسەن فەلاح، لە بەغدا، لەسەر دیواری چایخانەکەی وەستا ئەحمەد عەلی، بە بۆیەی رۆنی، تابلۆی شیرین و فەرهاد رەسم دەکات.

(١٩٥٦)

- حەسەن فەلاح، کە لە (١٩٥٥) هاتەوە کوردستان، چوو بۆ ئێران (نێوان تەورێز و خورەمشەهر)، لەوێ لە هەموو سەردەمێک زیاتر وێنەی دەکێشا. هەر لەوێش فێری رووسی بوو و شەڕی سیواس - ئەستەمبۆلی وێنەکێشا: چونکە حەزی دەکرد سۆڤیەتییەکان سەربکەون. دووای کوودەتاکەی رەشید عالی گەیلانی وێنەی بۆ گۆڤاری (الکشکول) دەکێشا کە خاوەنەکەی ناوی حمادی الضاهی بوو داوای لێدەکرد کاریکاتێری هیتلەر و نووری سەعیدی بۆ بکا.
- جابیر پیرداود لە بەغدا بەشداری لە خولێکی هونەری دەکات کە یۆنسکۆ رێکی خستبوو، جەواد سەلیم دەرسی تێیا دەگوتەوە. هەر لەوێش، لای جەواد سەلیم، فێری پەیکەری قوڕینە دەبێت.
- عەبدوللەتیف حەسەن بابا، قوتابییەکی نۆ ساڵەی پۆلی سێیەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی موزەفەریە لە هەولێر، بە تابلۆی " دایکم" لە پیشانگەیەکی نێودەوڵەتیدا لە ژاپۆن لە شاری تۆکیۆ بەشداری دەکات و خەڵاتی یەکەمی پێشانگە هونەرییەکە دەباتەوە. خەڵاتەکە بریتییە لە

مەدالیایەک کە وێنەی منداڵێکی تێدایە و بڕوانامەیەک بە زمانی ژاپۆنی و چەند کتێبێک. ئەم ڕووداوە نیشانەی ئەوەیە کە دەرسی رەسم لەلایەن مامۆستایانی رەسمی ئەو شارە چەنێک بەجوانی گوتراوەتەوە و ئاستی رەسم لە هەولێر چەند پێشکەوتوو بووە.
- دار المعلمات لە شاری هەولێر دەکرێتەوە و دەرسی رەسمی تێدا دەگوترێتەوە.
- دەرکەوتنی رەسم و پەیکەرەکانی حوسێن عەبدوللا کەسرە لە هەولێر.
- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی موفید حوسێن کەسرە لە هەولێر. محەممەد عارف لەبیرەوەتی:( موفید کەسرە ئەگەر بەردەوام بووایە هونەرمەندێکی بەهرەداری لی دەکەوتەوە. لە یادمە تابلۆیەکی کەرەڤادجۆی ئیتالیی زۆر بە ئەمانەتەوە نەقڵ کردبوو، زۆر وەستایانەش کاری تێدا کردبوو).
-. عەزیز سەلیم تا (١٩٥٦) لە ئەورووپا بووە. لەم وڵاتانەدا پیشانگای کردۆتەوە: فەرەنسا، ئیتالیا، چیکۆسلۆفاکیا، یۆگۆسلاڤیا، لەندەن، ڤیەننا. تابلۆکانی بە ئیمزای (کوردیش ئارت) دەناسرێنەوە.

- دەرکەوتنی تەخریم و تەختیتەکانی محەممەد مەولوود قادر لە هەولێر.
- محەممەد عارف و سلێمان شاکر، پەیمانگای بەغدایان تەواوکردووە و گەڕاونەتەوە هەولێر.
- فوئاد رەسوول ناجی لە گەرمەی داهێنانی هونەریدایە. بە چەقۆ نیشی دەکرد و بە پالێتنایت وێنەی دەکێشا. هونەرمەندێک بوو رۆحی داهێنانی خۆی هەبوو. پشتی بە راگوێزانی تابلۆ نەدەبەست.
- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی یەحیا مەرجان ( لەدایکبووی ١٩٣٦) لە هەولێر.

(پێنج شەممە ٩ تا ١٦/ ٨/ ١٩٥٦)
- پیشانگای کشتوکاڵی و پیشەسازی لە سلێمانی، کە میهرەجانێکی گەورەی هونەری رەسم و شانۆ و هونەری تر بوو بۆ ماوەی حەوت رۆژ، بە سەرپەرشتی و بەشداریی ئازاد شەوقی و خالید سەعید. سەردار زوهدی، مووەددەد رەشید جەوەدەت، ئەنوەر تووفی، قادر کوردی، جەمال بەختیار، تاهیر ئیبراهیم، ئەدوەرد ولیەم و زۆربەی هونەرمەندانی نیگارکێشی دیکەی سلێمانی بەشداربوونە. خالید سەعید خەڵاتی نیگاری وەرگرتووە.
- ئازاد شەوقی لەگەڵ خالید سەعید پیشانگایەکی هاوبەش دەکەنەوە لە سلێمانی لە (١٩٥٦).
- تابلۆ و چالاکییە هونەرییەکانی ئەنوەر تووفی: لە پێشانگاکانی ساڵانی پەنجای سلێمانی و بەغدا.

(١٩٥٧)
- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی محەممەد حەمە سەعید حەسەن ( لەدایکبووی ١٩٣٨) لە

هەڵەبجە. هەر هەمان ساڵ لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەردەگیرێت.
- نیگارکێشی کەرکوکی، د. عەبدوڵلا ئەمین مەلا تابلۆکانی خۆی دەخاتە سەر چەندین کارتی جەژنانەوە و بە سەدان نوسخە بلاویان دەکاتەوە.

(١٩٥٧/٦)
- لە هەولێر کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان دادەمەزرێت.
- بایەخدانێکی تایبەتیی گۆڤاری هەتاو، لە هەولێر، بە نیگار و هونەری رەسم، هەروەها ناساندنی هونەرمەندانی جیهانی بە خوێنەران و بلاوکردنەوەی هەواڵی هونەریی نیگارکێشان.

(١٩٥٧/ ٦ /١٩)
دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە سلێمانی. دەستەی دامەزرێن: فوئاد رەشید بەکر، شەفیقە سەعید، رەفیق چالاک، نووری محەممەد ئەمین وەشتی، محەممەد ساڵح دیلان، ئازاد شەوقی، خالید سەعید، ولیەم یۆحەننا، مستەفا ساڵح کەریم. ئەمە یەکەم تیپی شانۆیی و نیگارکێشانی مۆڵەت پێدراوی سلێمانییە. یەکەم هەڵبژاردنی گشتی لە ٥/ ٧ /١٩٥٧دا کراوە. کرانەوەیشی لە ١/ ٨دا بووە. رۆژنامەی ژینی ژمارە ١٣٥٥ ی رۆژی ٨/ ٨ /١٩٥٧ لەسەری نووسیوە. . کۆمیتەی وێنە و کۆڵین: ئازاد شەوقی، خالید سەعید، جەمال بەختیار. یەکەم هەڵبژاردنی گشتی لە ٥/ ٧ /١٩٥٧دا کراوە.
(٥/ ٧ /١٩٥٧): یەکەم هەڵبژاردنی گشتیی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی. کۆمیتەی وێنە و کۆڵین: ئازاد شەوقی، خالید سەعید، جەمال بەختیار.
(٦ تا ١٩٥٧/٧/١٣)
پیشانگەیەکی هاوبەشی ئازاد شەوقی لەگەڵ قوتابییانی خۆی لە سلێمانی. گۆرانی شاعیر سەر لەو پیشانگەیەدا دەدات و لە دەفتەری زیاراتدا چەند تێبینییەک لەبارەی ( ئەم نوێنەگایە ) تۆمار دەکات. تەسیری گۆران وردە وردە بەسەر ئازاد شەوقی دەست پێدەکات.
(١٩٥٧/٨/١) : کرانەوەی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی. رۆژنامەی ژینی ژمارە (١٣٥٥)ی رۆژی (٨/ ٨ /١٩٥٧) لەسەری نووسیوە.
١٩ /٨ /١٩٥٧ : لقێکی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە هەڵەبجە کرایەوە. فوئاد عیززەت مستەفا سەرۆکیان بوو.
١٩ /١١ /١٩٥٧
- پیشاندانی شانۆنامەی تاوان و تۆڵە، نووسراوی نووری وەشتی، دەرهێنانی: ئەنوەر تووفی، لەلایەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان. دیکۆری خالید سەعید و ئازاد شەوقی. رۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٦٥)ی رۆژی (٧/ ١٠/ ١٩٥٧) و ژمارە (١٣٤٤)ی مانگی نۆڤەمبەری (١٩٥٧) باسی

کردووه و رەخنەی لێگرتووه.
- جەمال حامد ئەسعەد بەختیار ئەندامی دستەی بەڕێوەبەرایەتیی کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بووه، بەشێوەیەکی ساکار و فۆتۆگرافی، رەسم کردووه.
- ئازاد شەوقی بۆ ماوەیەکی کورت بە زەماله دەچێتە زانکۆی ئەمەریکی لە بەیرووت.
(١٩٥٨)
- جابیر پیردواد: هونەر لە زەمانی عبدالکریم قاسمدا بووژایەوه. پەیکەری کچە قوتابی و کوڕە قوتابی، پەیکەری کندی، سەربازێک، هەڵگری مەشخەڵی ئۆلۆمپیاد، کۆتر سەلام و یاریکەرە وەرزشەوانەکانی سەر دیواری مەلعەبی هەولێر دروست دەکات. لە ساڵی ١٩٥٨ بەولاوە زیاتر بایەخ بە پەیکەرتاشی دەدات.
- دروستکردنی یەکەم پەیکەر کە لە مەیدانێکی هەولێر دابندرێت: پەیکەری عەبدولکەریم قاسم، لەلایەن هونەرمەندی عەرەبی عیراقی، اسماعیل فتاح الترک، لە فلکەی زەعیم.
- کرانەوەی پیشانگەی هونەرمەندانی هەولێر لە هەولێر، کە سلێمان شاکر بەشداریی تیا دەکات.
- خالد سەعید لە ماوەی (١٩٥٩) تا (١٩٦٣) بە زەماله لە ئیتالیا خوێندوویەتی. کە گەڕایەوه، وەک دیکۆریستێک بە فەرمانبەری لە تەلەفزیۆنی بەغدا ئیشی دەکرد.
- جەواد رەسوول ناجی لە (١٩٥٨) بە وەفد، لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی دیکەی شاری هەولێر (جابیر پیرداود، محەمەد عارف، سلێمان شاکر..) نێردرانە ڤیەننا.
- قادر کوردی خوێندنی پەیمانگەی بەغدا تەواو دەکات.
- سەردار زوهدی: دروستکردنی پەیکەری شێخ مەحموود لەسلێمانی. شێخ لەتیف لێی وەردەگرێت.
- دانیال قەصاب لە کۆتایی پەنجاکاندا نەفی کراوە بۆ ئیسرائیل و کراوەتە عەمیدی هونەرە جوانەکان لە تەل ئەبیب.
- دەرکەوتنی رەسم و تابلۆکانی چەندین هونەرمەندی گەنجی تازە هەلکەوتوو:
١- محەمەد کاکە محەمەد( لەدایکبووی ١٩٣٤) لە سلێمانی، لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا وەردەگیرێت.
٢- شمس الدین فارس (لەدایکبووەی مقدادیە ١٩٣٧) لە بەغدا.
٣- ئەسکەندەر عوسمان لە هەولێر (لە ١٩٣٨ لەدایکبووه).
٤- کامل ئەحمەد مەعرووف (لە ١٩٣٩ لەدایکبووه).
٥- مەحموود عەلی کاکی( لەدایکبووی ١٩٤٠) لە سلێمانی.
٦- شێرزاد مەحموود شەوقی (لەدایکبووی ١٩٤١) لە سلێمانی.
٧- تاهیر پیرداود ( برای جابیر پیرداود)، کە دوکانێکی رەسم (مەرسەمێک) لە هەولێر دەکاتەوه.

٨ - تاهیر ئیبراهیم فەتاح (لەدایکبووی ١٩٤٢) لە سلێمانی. ئنجا نووری ئیسماعیل و زۆری دیکەش.

(١٩٥٨/٣/٢١)

- بە فەرمانی ژمارە (٢٨١٦)ی رۆژی (١٩٥٨/٣/٢١) مەڵبەندی هۆیەکانی روونکردنەوەی بینین و بیستن لە سلێمانی دەکرێتەوە و ئازاد شەوقی دەکرێتە لێپرسراوی.

- بە سەرپەرشتیی ئازاد شەوقی لە سلێمانی پیشانگەی کشتوکاڵ و ئاژەڵ دەکرێتەوە. پاشان بۆ ماوەیەکی کورت زەماڵەی بۆ دەردەچێت بۆ کالیفۆرنیا بۆ خوێندنی دیکۆری شانۆیی منداڵ.

(١٥ تا ١٩٥٨/٦/١٨)

کرانەوەی پیشانگەی دووەمی ساڵانەی وێنە و وسائل الایضاح لە سلێمانی بۆ قوتابییان و مامۆستایانی رەسم و هونەرمەندان، بە چاودێری موتەصەریفی سلێمانی، عبدالمطلب امین، بە سەرپەرشتیی ئازاد شەوقی لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی. عومەر عەلی ئەمین بە یەک تابلۆی زەیتی (هەڵپەرکێی کوردی) بەشداریی کردووە (٥ر١ بە ٧٠ر. سم). پیاوێکی کوێتی بە پازدە دینار کڕیبووی.

١٩٥٩/٣/٣١

- قوتابخانەی ناوەندیی سلێمانی بە چاودێری موتەصەریفی سلێمانی و بە سەرپەرشتیی ئازاد شەوقی پیشانگەی ساڵانەی خۆی دەکاتەوە لە هۆڵی کتێبخانە.

- ئازاد شەوقی لەگەڵ جەواد رسول پشانگەیان کردووە لە هەولێر خالد سەعید و عزالدین فەیزی هاتوون.

- سەردار زوهدی دیکۆری شانۆگەریی مەم و زین لە سلێمانی سازدەکات.

■

بەشی سێیەم

# پێشڕەوەکانی هونەری شێوەکاریی مۆدێرن لە کوردستانی عیراقدا

دانیال قەصاب
حەسەن فەلاح
عەزیز سەلیم
حوسێن حوزنی موکریانی
بەدیع حسێن باباجان
خالد سەعید
ئەنوەر تووفی
جەواد ڕەسوول ناجی
ئەسکەندەر جامباز
جەمال بەختیار

# دانیال قەصاب

## دامەزرێنی هونەری شێوەکاریی مۆدێرن
## لە کوردستانی عیراقدا

دانیال قەصاب یەکەمین نیگارکێشی هاوچەرخی شاری هەولێر، لە سالآنی ۱۹۲۰ ـ ۱۹٥۰ مامۆستای مامۆستایانی رەسم بووە لە هەولێر. یەکێک بووە لە پێشەنگەکانی هونەری شێوەکاریی مۆدێرن نەک تەنیا لە کوردستانی عیراقدا، بەڵکو لە سەرجەم عیراقدا.

لە ١٤ تا ٢٤ ی تشرینی یەکەمی (١٩٤١)، دانیال قەصاب دەچێتە بەغدا و پێوەندیی بە هونەرمەندە عیراقییەکانی (اصدقاء الفن) دەکات. بە شایەدیی حمدی خلف و شاکر حسن ال سعید: لەگەڵ گرووپی اصدقاء الفن، واتە لەگەڵ گەورەترین هونەرمەندە عیراقییەکان، لە قاعەی بینایەی جمعیە الهلال الاحمر لە بەغدا، بەشداریی لە یەکەم پیشانگەی هاوبەشی اصدقاء الفن دەکات.

هەروەها لە (١٩٤٣)دا، دانیال قەصاب لە بەغدا، بە شایەدیی شاکر حسن ال سعید: دیسان لەگەڵ گرووپی (اصدقاء الفن) لە قاعەی (المعهد الثقافی البریطانی) لە بەغدا، بەشداریی کردووە لە پیشانگەی هاوبەشی سالآنەی سێیەمی اصدقاء الفن.

بایەخی ئەم هونەرمەندە هەولێرییە لەوەدا زیاتر دەردەکەوێت ئەگەر بزانین کە لە (١٩٥١)دا لەگەڵ جواد سلیم و فایەق حسن و شاکر حسن ال سعید و محمود صبری، بەشداری دەکات لە دامەزراندنی گەورەترین و گرنگترین گرووپی هونەری شێوەکاریی عیراقی (جماعە بغداد للفن الحدیث) کە پیشانگەی یەکەمیان لە هۆڵی (متحف الازیاء) کردووە. حمدی خلف دەڵێ: تابلۆی دانیالیشی تێدا بووە. هەروەها هەندێ لە ئەندامەکانی دیکەیش لەو گرووپەدا هونەرمەندی کوردی شاری کەرکووک بوون، لەوانە: عەتا سەبری.

بەم شێوەیە، ئەم نیگارکێشە هەولێرییە «بێدەنگ» و «شەرمن» و نەناسراوە، لە سالآنی

۱۹٤۰ و سەرەتای ۱۹٥۰دا، بەشداریی لە دامەزراندن و چالاکییەکانی گەورەترین و گرنگترین دوو گرووپی گرنگی جموجۆلی شێوەکاریی عیراق دەکات. ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێ کە ناوبراو رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ئاستی هونەری نیگارکێشیی هەموو عیراقدا. هونەرمەند و رەخنەگری گەورەی عیراق، شاکر حسن ال سعید، لە کتێبەکەی خۆیدا (فصول من تاریخ الحرکة التشکیلیة في العراق) بە گرنگی و بایەخەوە ناوی ئەم هونەرمەندە مەزنە کوردەی بردووە. بەڵام دانیال قەصاب لەبەرئەوەی جوولەکە بووە، لە رەخنەی هونەری شێوەکاریی عیراقیدا هێندە بایەخی پێ نەدراوە، فەرامۆش کراوە. تەنانەت هەر بۆیەش، تابلۆکانیشی لە مۆزەخانەکانی بەغدا حجزکراون، ناهێڵن کەس بیانبینێ.

دانیال قەصاب لەسەرەتادا (لە سالآنی ۱۹۲۰ ـ ۱۹۳۰) لە رەسمکردندا نەقلی دەکرد، واتە تابلۆ جیهانییەکانی دەگواستەوە. پاشان (لە سالآنی ۱۹٤۰) بەولاوە دەستی کردە داهێنانی خۆی. بەرهەمەکانی، بەشێوەیەکی گشتی، دەچنەوە سەر رێبازی ریالیزم. یەکەم نیگارکێشی کوردە کە بەشێوەی هاوچەرخ و ئەورووپایی کاری کردبێت، هەروەها نیگاری لە (فطریەت) رزگار کردبێت و بەشێوەیەکی ئەکادیمی رەسمی کردبێت. رەنگی نارنجیی زۆر بەکاردەهێنا. زۆربەی بابەتەکانیشی، دیمەنی ژیانی کوردستان و بەتایبەتی دەشتی هەولێر بوون.

## کورتەی ژیانی

دانیال عوزێر قەصاب (هەندێکیش دەڵێن: دانیال داود پەترۆس قەصاب)، ساڵی لەدایکبوونی دیار نییە و ناشزانین کەی و لەکوێ کۆچی دوایی کردووە. بەڵام ئاشکرایە: لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، لە هەولێر، لە خێزانێکی جوولەکە لەدایکبووە. دانیال قەصاب، ناوەکەی، لە تۆماری مامۆستایانی پەروەردەی ساڵانی ۱۹۳۰ لە هەولێر، بە (موسەویی کورد) تۆمار کراوە. سێ برای هەبووە، ئەوانیش لە هەولێر ژیاون: شاهێن، ناحووم، هەروەها منیر قەصاب کە ئەویش هونەرمەندێکی نیگارکێش بووە.

دانیال، وەک تاهیر ئەحمەد حەویزی باسی دەکات: (پیاوێکی سپیلکەی مەیلەو کەڵەگەتی جوانی رووخۆشی گورجوگۆڵ بوو. دەرسی وێنەی پێ دەگوتین. ئەمە لە ساڵی ۱۹۳٤-۱۹۳٥. ئەوکاتە من و دڵدار پۆلی یەکەمی ناوەندیی هەولێر بووین).

ناوبراو منداڵی و گەنجێتی خۆی، لە ساڵانی ۱۹۱۰ ـ ۱۹۲۰ لە هەولێر بەسەربردووە. دانیال لاعیبی فتبۆڵیش بووە و لە تیپی هەڵبژاردەی هەولێری ساڵانی ۱۹۲۰ ـ ۱۹۳۰ گەمەی کردووە. تا ساڵی (۱۹۳٥) مامۆستای رەسم بووە لە قوتابخانەی " اربیل اولی". لەوێ، کۆمەڵێک قوتابیی فێری رەسم کردووە کە پاشان بوونەتە هونەرمەندی گەورە، لەوانە: جابیر پیرداود و جەواد رەسوول ناجی و فوئاد رەسوول ناجی و دڵداری شاعیر. ئەمە جگە لەوەی هونەرمەندانی گەورەی وەکو سلێمان شاکریش بەو سەرسام بوونە. لە ۱۹۳٦ گواستراوەتەوە سانەویی هەولێر. سلێمان شاکر لە ژمارە (۲۹) ی گۆڤاری (رامان) دا دەڵێ: (ئەوکاتە ماڵی دانیال ببووە کۆڕی رۆشنبیران و پیاوماقوولانی هونەردۆست کە رەسمی پۆرترێتی هەندێکیانی کردووە، رۆڵێکی

دیاری هەبوو لە بلاوکردنەوەی رۆشنبیری بەگشتی و چێژوەرگرتن لە هونەر لە شاری هەولێر). لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٤١، دەچێتە بەغدا بۆ بەشداریکردن لە یەکەم پیشانگەی هاوبەشی اصدقاء الفن. لە ١٩٤٥ و ١٩٤٦ چەند پێشانگەیەکی لە کۆیە کردۆتەوە. لە ١٩٤٨ لە هەولێرەوە چووە بۆ بەغدا و بووەتە مامۆستای پەیمانگای هونەرە جوانەکان.

دانیال قەصاب لە سەرەتای سالانی (١٩٥٠) جاربەجار لە بەغداوە سەری لە هەولێر داوەتەوە. لە ناوەڕاستی پەنجاکانیشدا نەفی کراوە بۆ ئیسرائیل و لەوێ یەکسەر کراوەتە عەمیدی هونەرە جوانەکان لە تەل ئەبیب. ئنجا لە ١٩٦٠ ماوەیەک لە لەندەن ژیاوە. لە ١٩٦١ لە لەندەن مامۆستا نەژادی خاوەن کتێبخانەی هاوڕێ لە هەولێر، بینیویەتی.

## سەرەتای هونەریی

دیار نیە دانیال قەصاب چۆن فێری رەسم بووە و لە چ کەسێکەوە بۆی ماوەتەوە. لەگەڵ ئەمەش دەتوانین چەند هۆکارێک بۆ سەرەتای بایەخدانی رەسم لای دانیال دەسنیشان بکەین:

١ـ دانیال لە خێزانێکی هونەرمەند و هونەردۆستدا پەروەردە کراوە: سێ برای هەبووە و ئەوانیش هەر رەسسام بوونە: شاهێن، دەرسی رەسمی گوتۆتەوە. هەروەها ناحووم قەصاب و منیر قەصاب. سلێمان شاکر بیریەتی: منیر قەصاب تابلۆیەکی مۆرێللۆی ئیسپانیی نەقڵ کردبوو (ئەو دوو منداڵەی کاڵەک و ترێ دەخۆن) لە ژووری مودیری مەدرەسەی ثانوبەی اربیل هەڵیواسیبوو. هەروەها جابیر پیرداود لەم بارەوە دەڵێ: منیر قەصاب یەکەم جار لە رواندز دادەمەزرێت، دەورێکی دیاری هەبوو لە پەرەپێدانی هونەری شێوەکاری لە رواندز لە سالانی (١٩٤٠).

٢ـ کابرایەکی ئەرمەنیی رەسسام، جابیر پیرداود دەڵێ: " لە کۆتایی سالانی بیستەکاندا لە هەولێر هەبوو، رەسامێکی زۆر گەورە بوو، مامۆستا بووە لە رەسمکردندا. نیگاری دەکێشا و دەیفرۆشتە دەولەمەند و خاوەن قاوەخانە و چایخانەکان، هەر بەو پارەیەش دەژیا. مامۆستا سلێمان شاکر دەڵێ (کوردی ئەودیو بووە و ناوی جهانگیر بووە. دیمەنی سروشتی کوردستان و یانی کوردەواریی دەکرد، هەروەها پڕۆپاگاندەی تایە و کەرەستەی ئۆتۆمبیلی لەسەر دیواری گەراجەکە رەسم دەکرد). لە سالی (١٩٣١) لە نزیک چایخانەی عەبۆ لەناو گەراجەکەی جەلال عەبدۆکدا خۆی کوشت: خۆی بە پەت خنکاند. دانیال قەصابی هونەرمەند لەژێر تەئسیری ئەودا هاتە مەیدانی هونەر". دیسان لە سەرەتای سالانی (١٩٢٠)دا رەسسامێکی دیکە لە هەولێر کاری کردووە بە ناوی ئیسحاق هەولێری.

٣ـ بەپێی سجللاتی پەروەردەی کۆن، لە سەردەمی عوسمانیدا دەرسی (رەسم و ئال ئیشلەری کاری دەست) لە قوتابخانەی سەرەتایی دانیالدا لە هەولێر خوێنراوە. بێگومان بێ تەئسیر نەبووە.

بەم شێوەیە، لەژێر ئەم کاریگەریانەدا، بەهرەی دانیال لە کۆتایی سالانی ١٩٢٠دا گەشاوەتەوە و یەکەمین رەسم و تەختیتەکانی خۆی دروستکردووە و بۆتە یەکەم نیگارکێشی ناسراوی هەولێر و

یەکێک لە رابەرانی هونەری شێوەکاریی کوردی. بێگومان، لە سەرەتادا، چ خۆی و چ قوتابییەکانی، زیاتر تابلۆ جیهانییەکانیان گواستۆتەوە.

بە بۆچوونی مەغدید حاجی: دانیال قەصاب لە ۱۹۳۲پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی تەواو کردووە، ئنجا بە مووچەی ۱۲ دینار لە قوتابخانەی اربیل اولی تەعین بووە. بەلاّم دیار نیە لە کام پەیمانگە و لە کوێ تەواوی کردووە.

دانیال قەصاب لە سالّی (۱۹۳٤)، وەک جابیر پیرداود باسی دەکات: لە هەولێر لە لای سینەما سەلاحەدین، گەلەرییەکی نیگارکێشی ( مەرسەمێک) دەکاتەوە و دەست بە کار دەکات. ئەمە دەبێتە دووەم مەرسەم لە شاری هەولێر. چونکە لە سالاّنی (۱۹۳۲ - ۱۹۳۳) لیجنەی فنوونی جەمیلە (کاتی خۆی: لیجنەی فەن و تەمسیل ) لەناو قوتابخانەی سانەویی هەولێر مەرسەمێکی گشتی (ستۆدیۆیەکی رەسمی) دامەزراندبوو.

## پیشانگاکانی

لە (۱۹۳٦)

حوسێن حوزنی موکریانی، عەزیز سەلیم دەناسێنێت بە دانیال قەصاب (ئەوکاتە مامۆستای قوتابخانەی ئیبن خولەکان بووە) لە هەولێر. لە هەمان سالّدا، بە هاندان و پشتگیریی ح. ح. موکریانی، پیشانگایەکی هاوبەش دەکەنەوە لە بالکۆنەکەی قوتابخانەی ئیبن خولەکان. موکریانی - خۆی کارتی پرۆپاگاندەیان بۆ چاپ دەکات. عەزیز سەلیم بە (۱۲) تابلۆ و (۲) نەحت بەشدار دەبێت و دانیال قەصاب بە چەند تابلۆیەک. یەک لەوانە منارەی چۆلی بووە. پیشانگاکە ٤ رۆژی خایاندووە. ئەم پیشانگە هاوبەشەی دانیال قەصاب و عەزیز سەلیم، هێندەی ئاگادار بین، دەبێتە یەکەمین پیشانگەی نیگارکێشان لە شاری هەولێردا و لەوانەیە لە هەموو کوردستانی عیراقیشدا.

لە (۳٦ ـ ۱۹۳۷)

لە هەولێر، لیجنەی فنوونی جەمیلە، کە سەر بە ئامادەیی هەولێر بوو، بە بەشداری و سەرپەرشتیی دانیال قەصاب، پیشانگەیەکی گشتیی رەسمی، لەناو قوتابخانەکەدا بۆ هونەرمەندانی شاری هەولێر کردەوە و زۆر تابلۆی نایابی خستە روو و جێگەی سەرسورمان بوو. هونەرمەندەکان خودی قوتابیان بوون کە ئەمانە بوون: منیر و ناخووم عوزێر قەصابی براکانی دانیال، سەلاحەدین مستەفای محامی، رەشید عەبدولقادر ( کە ئێستا حاکمە لە هەولێر)، جەواد رەسوول ناجی، فوئاد رەسوول ناجی، عەبدوللا حوسێن کەسرە. تابلۆکان، هەم بە پاستێل و زەیتی، هەم بە قەلّەمی رەژوو بوون. هەمووشیان راگوێزانی چەندین تابلۆی جیهانی بوون. یەکەم وەرچەرخانی ئارەزووی ئەو کۆمەلە خەلّکانە بوو بۆ هونەر. جابیر پیرداود، لە چاوپێکەوتنێکی (رامان، ژ ۱۸) دا دەلّێ: ( ئەم پیشانگەیە لە سالّی ۱۹۳۷ - ۱۹۳۸دا بووە). بەم شێوەیە، ئەم پیشانگەیەی ناوبراو، دەبێتە دووەمین پیشانگای هونەری شێوەکاری لە شاری هەولێردا.

لە ۱٤ تا ۲٤ ی تشرینی یەکەمی (۱۹٤۱)

دانیال قەصاب لە بەغدا پێوەندیی بە اصدقا ء الفن دەکات. بە شایەدیی دوو رەخنەگری گەورەی عیراق، حمدی خلف و شاکر حسن ال سعید: لەگەڵ گرووپی اصدقا ء الفن، واتە لەگەڵ اکرم شکری و جواد سلیم و عبدالقادر الرسام و عەتا صەبری (لەدایکبووی ١٩١٣ کەرکووک) و حافظ الدروبی و شوکت سلیمان و نزیهە سلیم و ناهدە الحیدری و نزار سلیم، لە قاعەی بینایەی جمعیە الهلال الاحمر لە بەغدا، بەشداریی کردووە لە یەکەم پێشانگەی هاوبەشی اصدقا ء الفن کە بریتی بوو لە (٨٤) تابلۆی زەیتی و (١٦) تابلۆی ئاوی و (٣) تابلۆی پاستیل و ٥ تەختیت و ١٤ پارچە نەحت و ١٧ کاریکاتێر.

لە (١٩٤٣)

دانیال قەصاب لە بەغدا، بە شایەدیی شاکر حسن ال سعید: لەگەڵ گرووپی اصدقا ء الفن، واتە لەگەڵ اکرم شکري و جواد سلیم و عطا صبري و حافظ الدروبي و فایق حسن و نزیهة سلیم و ناهدة الحیدري و عیسي حنا و جمیل حمودي و حمید المحل و خالد سلیمان الجادر و دیزی الامیر و سلمان داود و عزالدین الصندوق، لە قاعەی (المعهد الثقافي البریطاني) لە بەغدا، بەشداریی کردووە لە پێشانگەی هاوبەشی ساڵانەی سێیەمی اصدقا ء الفن.

لە (؟ ١٩٤٥ - ؟ ١٩٤)

پێشانگەیەکی تابلۆ و نەحتی لە کۆیە کردۆتەوە: تابلۆیەکی مۆریللۆی ئیسپانیی نەقل کردبوو و گۆڕیبووی بە " کرێکارێک بە جلی کوردییەوە". بە رای سلێمان شاکر: «ئەم پێشانگایە لە ساڵانی ١٩٤٠ بووە، لەگەڵ کۆمەڵێک تابلۆ و نەحت. لە هەمان ساڵدایە ( ١٩٤٥ ) سێ تابلۆی ئاغا دزەییەکەی گوندی عوێیدی، منارەی چۆلی و دەرگای قەڵا دروست دەکات کە ئەمڕۆ دووانەکەی ئەخیر لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر پارێزراون».

لە (١٩٥١)

– لەگەڵ جواد سلیم و فایەق حسن و شاکر حسن ال سعید و محمود صبری، بەشداری دەکات لە دامەزراندنی جماعە بغداد للفن الحدیث، کە پێشانگەی یەکەمیان لە هۆڵی (متحف الازیا ء) کردەوە. حمدی خلف دەڵێ: تابلۆی دانیالیشی تێدا بووە. هەروەها هەندێ لە ئەندامەکانی دیکەیش لەو گرووپەدا هونەرمەندی کوردی شاری کەرکووک بوون، لەوانە: عەتا سەبری.

بەم شێوەیە، لە سایەی دانیال قەصاب دا، لە ماوەی ساڵانی (١٩٣٦ ـ ١٩٥١)دا، جموجۆڵی شێوەکاریی هاوچەرخ لە هەولێر گەیشتۆتە قۆناغی پێگەیشتن و فراژووبوون. نیشانەکانیشی، ئەمانە بوون:

١ـ پەلوپۆ هاویشتن بۆ رەنگ، بەکارهێنانی فایبەر و کوتاڵ و رۆن و تێکەڵکردنی کەرەستان: دوورکەوتنەوە لە خامە و خەڵووز.

٢ـ وردە وردە دوورکەوتنەوە لە نەقڵ کردن، رووکردنە داهێنان.

٣ـ ژمارەی نیگارکێشەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات: دانیال قەصاب و عەزیز سەلیم و جەواد رەسوول ناجی لە هەولێر ڕێبەرایەتیی ئەم جموجۆڵە دەکەن؛ لە سلێمانیش حەسەن فەلاح و خالد سەعید.

٤ـ لە ساڵی ١٩٥٢ بەملاوە هونەرمەندانی نیگارکێشی کورد، بەتایبەتی لە هەولێر و سلێمانییەوە، دەچنە پایتەخت و بەشێوەیەکی ئەکادیمی هونەری نیگارکێشی دەخوێنن:

٥ـ ژمارەیەک لە بەرهەمی نیگارکێشەکانی ئەو ساڵانە پارێزراون، دەبنە بەڵگەی سەلماندنی ئەو پێگەیشتنە هونەرییە.

٦ـ تابلۆ لە سەردیواری چایخانە و دیوەخان و ماڵە ئاغاکانەوە دەچێتە ناو خەڵک؛ بۆ یەکەم جار، هەر لە ساڵانی ١٩٣٠ بەولاوە، لە پێشانگاکاندا پیشانی جەماوەر دەدرێن.

٧ـ رەنگدانەوەی کاریگەریتیی شێواز و رێبازە هاوچەرخەکانی ئەورووپا، بەتایبەتی بەسەر بەرهەمەکانی دانیال قەصاب و عەزیز سەلیم و فوئاد رەسوول ناجی و مونیر قەصاب.

## تەختیت و تابلۆکانی

ـ چەند تابلۆیەکی، تا ساڵانی ١٩٧٠ش لە یانەی فەرمانبەرانی هەولێر هەڵواسرابوون.

ـ لە مۆزەخانەی رووداوی بەغدا چەندین تابلۆی (( حجز )) کراون.

ـ هەندێ لە بەرهەمەکانی دانیال لە کتێبی مەحموود دزەیی ( ژیانی دێهاتی ) بلاوکراونەتەوە.

ـ چەند تابلۆیەکی لە نادی مۆزەفینی کەرکووک پارێزراون.

ـ تابلۆی (قەسری باداوە)، مەلا قەندیی رەسم کردبوو. لە کاتی راپەرین چووبوونە ناو قەسرەکە و سووتاندبوویان.

ـ مامۆستا ئەنوەر عەلی ( یەحیا مەرجان دەیناسێ) تابلۆی دانیال قەصابی لایە.

ـ تابلۆی هەیە لە ماڵی یونسە قەندیی موهەندس.

ـ تابلۆیەکی لە لای مامۆستا نەژادی خاوەن کتێبخانەی هاوری ـ لە هەولێر پارێزراوە.

- دوو تابلۆی هەیە (قەلا) و (منارە) لە کتێبخانەی هەولێر.
- تابلۆیەکی، کە ١٩٤٥ کردوویەتی، لە ماڵی بایز ئاغای کوڕی ئیبراهیم ئاغای عەلی دزەیی، ئاغای گوندی سەید عوبێدی، پارێزراوە.
- چەند تابلۆیەکی لەلایەن محەممەد مەولوود هەولێرییەوە نەقل کراون، لەوانە: بووکگواستنەوە بە سواری ولاغ.
- چەند تابلۆیەکی لەلایەن ئەسکەندەر عوسمانەوە نەقل کراون، لەوانە: قەلای هەولێر.
- بە رای سلێمان شاکر: دانیال قەساب تابلۆیەکی مۆرتیللۆی ئیسپانیی نەقل کردبوو و گۆڕیبووی بە "کرێکارێک بە جلی کوردییەوە"، لە پیشانگایەکی کۆیە لە ساڵانی ١٩٤٠ پیشانی داوە لەگەڵ کۆمەڵێک تابلۆ و نەحت. کاکەی حاجی مەحموود ئەو تابلۆیەی دانیالی بە ٥ دینار کڕیوو و پاشان کەوتە لای هونەرمەند محەممەد مەولوود کە لە ١٩٦١ لە کاکەزیادی حاجی مەحموود کڕیبووی، پاشان فەوتا. ئێستا دەبێ ئەم تابلۆیە لە کۆیە بێت.

## ئەو هونەرمەندانەی قوتابیی دانیال بوونە و دانیال فێری رەسمی کردوون:

سلێمان شاکر، لە ژمارە (٢٩)ی گۆڤاری (رامان)دا دەڵێ: (هونەرمەندانی عیراقی، فەرەج عەبۆ، لەوکاتە لە سانەویی هەولێر قوتابی بوو، یەک لەو قوتابییانەی دانیال قەصاب بوو، کە لە بەردەستی ئەودا فێری رەسمکردن دەبوون و لەگەڵ قوتابییەکانی تر بەشداریی نیگارکێشەکانی دیکۆرەکانیان دەکرد)؛ هەروەها ئەم مامۆستایانەش شاگردی ناوبراو بوونە: جەواد رەسوول ناجی، عەبدوللا حوسێن کەسرە، جابیر پیرداود، مونیر و ئاحووم قەصاب، حاکم رەشید قادر، سەلاحەدین مستەفا، فەریق سەید جەمیل.

## بیر و رای گەورە هونەرمەندان لەبارەی دانیال قەصاب

- دانیال یەکێکە لە رووادی جموجۆڵی هونەری رەسم لە کوردستاندا
ئازاد شەوقی: ٧/ ١٩٩٥
- دانیال بە شێوازی کلاسیکی ئەورووپی کاری دەکرد. ئیشەکانی زۆر جوان بوون. رەنگی نارنجی و قاوەیی زۆر بەکاردەهێنا. بە ئیشەکانی دانیال قەصاب زۆر موعجیب بووم. بەلام نە من تەسیری ئەوم لەسەر هەبوو، نە ئەو تەسیری منی لەسەر هەبوو.
عەزیز سەلیم، تەلەفزیۆنی گوڵان: ١٠/ ١٩٩٧
- دانیال قەصاب هونەرمەندێکی بەتوانا بوو لە بەکارهێنانی رەنگدا.
محەممەد عارف، گ. رامان، ژ ٧
- خەڵک زۆر باسی دانیال قەصاب و مونیری برایان دەکرد کە رەسمیان کردووە. رەسمەکانیان دەچوونە ماڵان، تا ئێستاش لە هەندی ماڵی گەورە پیاوی هەولێر ماون. ئەوان فیکرەیەکیان بۆ رەسمکردن لەلای خەڵک دارشتبوو. هونەری شێوەکاری جوانکاری بوو. ئەو بابەتانەی دانیال

قەصاب رەسمی دەکردن گەلێ مەسەلەی کۆمەلایەتی و پێوەندیی زۆری بە چینی چەوساوەی میللەت هەبوو. ژیانی کۆمەلایەتی رەنگدانەوەی هەبوو لە تابلۆکانیدا.
سلێمان شاکر، گ. رامان.ژ١٥.

ـ دانیال قەصاب مامۆستامە و رابەری هونەری شێوەکارییە لە شاری هەولێردا، چونکە لەسەر دەستی ئەودا چەندین دەستە لە هونەرمەندان پەروەردە بوون کە تا دووا چرکەی ژیانیان وازیان لە هونەر نەهێنا.

جابیر پیرداود، گ. رامان، ژ ١٨.

– لە هونەرمەندە کوردەکان، دانیال قەصاب و منیر قەصاب کاریان تێکردووم.

محەمەد مەولورد، گ. رامان، ژ ٢٩

– کەس ناتوانێ دان بە هونەرمەندیی دانیالەفەندی نەنێت.

تاهیر ئەحمەد حەویزی، دەنگی میللەت، ژمارە (٤٢)

## چالاکییەکانی لە بواری دیکۆری شانۆیی و دەرهێنانی شانۆگەریدا

دانیال، بەپێی ئاگاداریی ئازاد شەوقی: رەسمی بۆ کتێبی ئەلفبای کوردیی قۆناغی سەرەتایی کردووە لە سالانی ١٩٤٠دا. هەروەها سەرپەرشتیی رازاندنەوەی چەند دیکۆرێکی دیکەی هۆلی شانۆی کردووە و چەندین نیگار و وێنەی لەسەر دیوار و تەختەی سەر شانۆکاندا دروستکردووە لە هەولێر و کۆیە و رواندز. گرنگترین چالاکییەکانی ناوبراو لە بواری شانۆدا ئەمانە بوون:

– لە پایزی ١٩٢١ و ١٩٣٠ شانۆگەریی سەلاحەددینی ئەییووبی لەو شانۆگەرییانەیە کە دانیال قصاب دەریهێناون جلوبەرگ و ماکیاژی بۆ کردوون.

– لە ١٩٣٣ شانۆگەریی (بەزەیی ئاوانبار / شفقە الشریر) پیشاندراوە لە هەولێر، لە قوتابخانەی شەوان، نزیک دەرمانخانەی باکووری ئێستا. ئەکتەرەکان: دانیال قەصاب، عبدالقادر ئەحمەد سامی، شێت مستەفا، وەهبی ئاگووب، بەشیر مستەفا، یووسف شێخ یەحیا، حەکیم القاضی.

– لە ١٩٣٤ بازرگانی ڤینیسی شکسپیر لە قوتابخانەی ناوەندیی کورانی هەولێر نواندرا محمد نافیع رۆستەمی تەرجەمەی کردبوو. دانیال قەصاب دەوری هەبووە و دیکۆری بۆ دروستکردووە.

ـ لە ١٣/١/١٩٣٥ شانۆی "سەلاحەددینی ئەییووبی"، لەلایەن عبدالرحمن شەرەف و دانیال قەصاب لە کۆیە، بۆ ماوەی چەند رۆژێک پێشکەش کراوە. ئەم شانۆگەرییە، کە لە نووسینی نەجیب حەدداد بووە، لە پێنج پەردەی پەخشان و شیعری پێکهاتبوو، لە شانۆگەرییەکی والتەر سکووتی نووسەری ئۆسکۆتلەندی وەرگیرابوو.

ـ لە ١٩٤٠ شانۆگەریی عوتەیل لە رواندز پیشان دراوە، لە ئامادەکردن و دەرهێنانی دانیال قەصاب بووە.

ـ لە ١٩٣٩ یان ١٩٤١ شانۆی "سەلاحەددینی ئەییووبی، لەلایەن دانیال قەصاب لە هەولێر

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک پێشکەش کراوە. ئەم شانۆگەرییە، کە لە نووسینی نەجیب حەدداد بووە، دیسانەوە لە هەولێر لە ئامادەیی هەولێر پیشان درا. تاهیر ئەحمەد حەوێزی دەڵێ: (دانیال قەصاب دیکۆریست بووە، تەنانی تەقسیماتی گڵۆپی کارەبای لەناو حەوشەکە وا دانابوو کە هەر جارە بەشێک تیشکی گڵۆپ لێی بدات. ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ، مستەر ئادمۆن، چووبووە سەردانی ئەم شانۆگەرییە).

ـ لە ١٩٤٨، دانیال قەصاب کە لە هونەرەکانی شانۆدا بەهرەدارێکی کارامە بووە، کاتێ لە بەغدا بۆ یەکەم جار سینەما دروستکرا، بانگ کرایە بەغدا و لەوێ دیکۆری سینەما ڕۆیال ئەو دایمەزراند، هەروەها دیکۆری بۆ فیلمی "علیا و عصام" دروست کرد. کاتێ لە هەولێرەوە چووە بەغدا، بووە مامۆستای پەیمانگای هونەرە جوانەکان. کتێبێکیشی لەبارەی دەرهێنان نووسیوە.

– لە ١٩٤٠ لە هەولێر، لە ئامادەیی هەولێر، تاهیر حەوێزی دەڵێ: لە حەوشەکەیا شانۆیەک رێکخرا، مامۆستای وێنە (دانیال ئەفەندی) کە جوولەکەی هەولێر و زۆر هونەرمەند بوو رێکی خست، تەنانی تەقسیماتی گڵۆپی کارەبای لەناو شانۆکە وادانا بووکە هەر جارە بەشێک تیشکی گڵۆپ لێی بدات. تازە «پیرمەم»و چیای «سەریەن» داندرا بوو بکرێنە هاوینە هەوار و هاوینان وەصی و مەلیک بێنە ئەوێ؛ (سالح زەکی بەگ صاحێبقران) موتەسەریف بوو. ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ (مستەر ئادمۆن) چوو بووە سەردانی ئەوێ، (دانیال ئەفەندی) لە خۆشیان هەندەی تر بایەخی پێدابوو، خۆی زۆر ماندوو کرد بوو. بۆ لای ئێوارە باو و بۆران هەڵیکرد، شانۆ و پەردەی تێک و لوول دا. ئەدمۆنس کە گەڕابۆوە، پێیان وت: «ئەمشەو بمێنێوە» وتی: «لەسەر مەوعیدم و ناتوانم...» داوای دەفتەرەکەی کرد، بردی لەگەڵ خۆی. (دانیال) لە تاوانا دەستی خۆی دەشکاندەوە و لە چۆکی خۆی دەدا. بۆ سبەینێ، شانۆکە رێک خرایەوە، سێ شەوان لەسەریەک نمایش کرا. خەڵقێکی زۆر بانگ کران. وادەزانم مامۆستا گیو موکریانی (وێنەگری هونەراوی) گەلێ وێنەی گرتبووین. جارێکیش لە ڕۆژنامەیەکی کوردستانی بلاوکراوەتەوە.

# حەسەن فەلاح
## ( ١٩١٠ئ سلێمانی ـ ١٩٧٦ بەغدا )

حەسەن فەلاح وێنەکێشێکی سەرەتایی ( فطری ) و خۆشنووسێکی بەهرەمەند بووە. بە یەکەمین نیگارکێش دەژمێردرێت کە هونەری رەسم و نیگارکێشانی هاوچەرخی لە شاری سلێمانی دامەزراندبێت و بڵاوی کردبێتەوە. بە یەکێک لە یەکەمین هونەرمەندە شێوەکارەکانی کوردستانی عیراق دەژمێردرێت.

## پۆرترێت

ـ ناوی شەمسەدین عەبدولقادر، نەوەی شێخ سەلامی شاعیرە. خەڵکی سلێمانییە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەدایکبووە. ماڵیان لە گەڕەکی کانیسکان بووە، لە کۆڵانی بەرامبەر شەخسەکەی شێخ جافر لە شەقامی کاکەحەمەدی شێخ.

ـ باوکی، کە لە شێخەکانی بەرزنجە بووە و لە ئەستەمبوڵ خوێندبووی، پێش شەڕی یەکەم، قازیی بەغدا بووە، پاشان کراوە بە قازیی کەربەلا و دیوانیە. چوار برا و دوو خوشک بوونە. کە کەرکووک کەوتە دەست ئینگلیز باوکی مرد.

ـ زمانی رووسی و ئینگلیزی و عەرەبی و فارسی و تورکیی زانیوە.

ـ لە شۆڕشی شێخ مەحموود بەشدار بووە. لە ژمارە ( ا )ی رۆژنامەی امید استقلال دا لە ئەیلوولی ١٩٢٣، لە یاسی کابینەکەی حکوومەتی شێخ مەحمووددا بە "ناظر الخدمە" ناوی هاتووە.

ـ برایەکی ناوبراو، ناوی خالید بووە، ماوەیەک مودیر ناحیە بوو لە دەوروبەری موسڵ. براکەی دیکەی، عەبدوڵلا عادل، ئەفسەری عوسمانلی بووە؛ تا ١٩٢٧ هاوخەباتی شێخ مەحموود بوو، لە خێزانێکی ئاینی پەروەردە بووە. کە شێخ مەحموود گیراوە حەسەن فەلاح و برایەکەی چوونەتە موسڵ بۆ خوێندنی صنایع لە بەشی میکانیک، کە لە دواییدا هەر لەوێش تەعین بۆتەوە.

ـ پاشان هەر لای ئینگلیزەکان بووە بە ئیتەری ئوتومبیل و هەر لەوێش فێری ئینگلیزی بووە ( ئەو کاتە تەمەنی بیست و دوو ساڵ بووە و لە گەرمەی رەسمکردندا بووە). پاشان لە فەرمانگەی ئیشغالی کەرکووک بووە بە شوفێر لە رێی کەرکووک ـ هەولێر. پێش دەرچوونی دیناری عیراقی بە ساڵێک لە کارگەی نەوت ئیشی کردووە. دووای ئەوە بۆ ماوەی سێ مانگ لە کاتی دروستکردنی فڕۆکە لە کەرکووک لەسەر مەکینە قورسەکان کاری کردووە. لە تەمەنی سی ساڵیدا لە کەرکووک ژنێکی مووسڵاویی هێناوە: چوار کوڕ و چوار کچی هەبووە.

ـ وەک عەزیز سەلیم باسی دەکات: ( لە ساڵانی ١٩٣٠دا منداڵکارە و گەنجی رەسسام هەبوونە، حەسەن فەلاح و عەزیز سەلیم هانیان داون بۆ رەسم. کەلوپەلی رەسمیان لە شۆرىجەی کەرکووک و بەغدا کڕیوە، داویانە بەوان. لە سلێمانی، لەگەڵ عەزیز سەلیم، لە چایخانەی رەشۆل بەیەک دەگەیشتن).

ـ لە ساڵی ١٩٤١ لە کاتی شەڕەکەی رەشید عالی گەیلانی دا، لە بەغدا لە گۆڤاری (حەبەز بۆز) بە کاریکاتێر وێنەی (عەبدول ئیلا - وەیسی) و (نووری سەعید) دەکات. هەر لە هەمان ساڵدا، لە ترسی ئینگلیزەکان رایکرد بۆ سووریا، چونکە فەلاح لە لایەنگرانی رەشید عەلی گەیلانی بوو، لەوێ بووە شوفێری تراکتۆر. پاشان چوو بۆ کوێت، لەوێ تابلۆی شەڕی یەرمووک و سەلاحەدینی ئەییووبی و دەرکەوتنی ئیسلامی کێشا. هەروەها پۆرترێتی بۆ شێخ صباح السالم الصباح دروستکرد. تا ١٩٥٥ لە کوێت مایەوە. کاتێ لە ١٩٥٥دا هاتەوە کوردستان چوو بۆ ئێران (ئێوان تەورێز و خورەمشەهر) کە لەوێ لە هەموو سەردەمێک زیاتر وێنەی دەکێشا، هەر لەوێش فێری رووسی بوو و شەڕی سیواس ـ ئەستەمبۆلی وێنەکێشا: چونکە حەزی دەکرد سۆڤیەتیەکان سەربکەون. بۆیەش رووسەکان زۆر هانیان دەدا بۆ رەسمکردن. لەوێ، لەسەر چادر و سەیارە و لەسەر دیواری چایخانە و چێشتخانەکانی جلفا کە دەکەوێتە سەر سنووری سۆڤیەت لە نزیک رووباری ئاراز زۆر رەسمی کرد. لەو رەسمانەدا هانی سوپای رووسی دەدا بۆ سەرکەوتن، ئەمەش بێ پارەوەرگرتن و بێ ئەوەی کۆمۆنیستیش بێت.

ـ پاش جەنگی دووەم ساڵێک لە تاران مایەوە، لە ژووری هوتێلێک دەژیا: لەوێ وێنەی پڕۆپاگەندەی دەکێشا و دیمەنی سروشتی دەکرد و خەتخۆشیشی دەکرد. لە چایخانەکانیشدا، بێ داخوازیی هیچ کەس، رەسمی رۆستەم و زۆراب و شیرین و فەرهاد و ئیمامی عەلیی دەکرد.

ـ کە بەیەکجاری گەڕایەوە کوردستان و لە سلێمانی، سەرتاپای چایخانەکەی رەشۆڵی گۆرانیبێژی ، رۆژی بە دوو دینار، کرد بە نەخش و نیگار و رەسم. رەشۆڵی گۆرانیبێژ بە هەموو ئەو کەسانەی ناساند کە حەزیان لە رەسم دەکرد، ئیدی وردە وردە کەوتە رەسمکردنی دیواری ماڵەکانی سلێمانی: ماڵی ئیبراهیم مستەفا ئاغا، ماڵی فەقێ رەشیدی قەشان، پاشان دیوارەکانی چایخانەی مەولەوی کە هی مەحموود عەلی بوو.

ـ لە ١٩٦٠ گەڕایەوە بەغدا و بوو بە شوفێر ، تا لە ١٩٧٦ گیانی سپارد. لە ساڵەکانی دووایی ژیانیدا لە بەغدا لە گەڕەکی الصابونچیە لە هوتێلێک بەتەنیا دەژیا، بە رەسمکردن دەژیا و هیچ بژێوێکی دیکەی نەبوو بۆ ژیان. چوار کچ و سێ کوڕی لەدووا بەجێ ماوە.

حەسەن فەلاح لە بواری شانۆشدا کاری کردووە. هەر بە هۆی شانۆشەوە بوو ناونرا حەسەن فەلاح. لە تەمووزی ساڵی ١٩٤٦دا لە سلێمانی، لە شانۆنامەی (لە رێی نیشتیماندا) کە رەفیق

چالاک کردبووی بە کوردی، دەوری بینیوە. هەروەها لەگەڵ رەفیق چالاک لە شانۆی ( گوڵی خوێناوی) دەوری بینی، مکیاژ و دیکۆری شانۆکەی کرد پاشان شانۆکەی برد بۆ هەولێریش.

## بەرهەم و تابلۆکانی

جگە لەو تابلۆیانەی لەسەرەوەدا ناومان بردن، ئەم بەرهەمانەی خوارەوەش دەدرێنە پاڵ حەسەن فەلاح:

ـ کۆنترین تابلۆی تاکو ئێستا بە ئێمە گەیشتبێ ( شەڕەکەی دەربەندی بازیان) مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹۱۹ کە باسی شەڕەکەی شێخ مەحمود و ئینگلیزەکان دەکات لە دەربەندی بازیان.

ـ وەک عەزیز سەلیم باسی دەکات: ( لە ساڵانی ۱۹۳۳ ـ ۱۹۳٤دا لەگەڵ عەزیز سەلیم لە سلێمانی، لەسەر دیواری قاوەخانەکانی ئەسحابە سپی ( لە جادەی کاوەی ئێستا ) تابلۆ و پۆرترێتیان دروست دەکرد.

ـ لەسەر دیواری ماڵ و چایخانە و دیواری ناوبازاڕەکان رەسمی دەکرد ( لە سلێمانی و لە بەغدا). تا ئەم دووایییەش نیگارەکانی بەسەر دیوارەکانی شاری سلێمانیدا هەر مابوون. هەروەها گەلێک تابلۆی هەبوون لەسەر دیواری ئەو هوتێلانەی کە لە بەغدا تێیدا دەژیا.

ـ تابلۆکانی لە سلێمانی و بەغدا و ئێران و سووریا و سۆڤیەت پیشان دراون. لەسەر چادر و سەیارە و لەسەر دیواری چایخانە و چێشتخانەکاندا رەسمی دیمەنی سروشتی و رۆستەم و زۆراب و شیرین و فەرهاد و ئیمامی عەلیی دەکرد، هەروەها وێنەی پڕۆپاگەندە.

ـ لە دانانی نەخشەی هەر دوو بەنداوەکەی دوکان و دەربەندیخاندا بەشدار بووە.

ـ دووای کودەتاکەی رەشید عالی گەیلانی وێنەی بۆ گۆڤاری ( الکشکول) دەکێشا کە خاوەنەکەی ناوی حمادی الضاهی بوو داوای لێدەکرد کاریکاتێری هیتلەر و نووری سەعیدی بۆ بکا.

ـ تابلۆ زۆر ناسراوەکانی، وەک جەمال رەشید باسی دەکات، ئەمانەن: شەڕەکەی دەربەندی بازیان، مەم و زین، سەلاحەددینی ئەییووبی، ئەهواری باشووری عیراق، شیرین و فەرهاد، کۆچی خێلە جافان.

ئەمڕۆ تابلۆکانی فەلاح زۆر بەدەگمەن دەست دەکەون: لە ماڵە کۆنەکانی سلێمانیدا و بەشێکیشیان لە بەغدان (لە هوتێلی فندق الهلال الکبیر).

شێوازی حەسەن فەلاح خۆڕسک ( فطری) و سەرەتایی بوو، شێوازی هونەرمەند هنری رۆسۆمان بیردەخاتەوە. بابەتەکانیشی هەمووی لە واقیعەوە هەڵدەهێنجا، بۆیە دەکرێ ناو لە شێوازی حەسەن فەلاح بنرێت ریالیزمی خۆڕسک. تابلۆکانی هێمن و روونن، رەنگی سەوز بەسەر زۆربەی تابلۆکانییەوە دیارە، تەنانەت لە تابلۆکەی شەڕی دەربەندی بازیانیشدا.

حەسەن فەلاح سەبارەت بەوەی کە وڵاتانی ئەورووپای دیبوو، کاتێ وێنەی لادێیەکی کوردستانی دەکێشا یەکسەر تراکتۆر و ئوتومبیلیشی لەو دێیەدا رەسم دەکرد ( هەرچەند ئەوکاتە ئوتومبیل و تراکتۆر نەگەشتبوونە کوردستان). داهاتووی کوردستانی دەخوێندەوە و خەونی بە

جوانتربوون و خۆشتربوونی ژیانی گەلەکەی خۆیەوە دەدیت و دەیگوت: ( من کوردستانی داهاتووم خۆش دەوێ ). بۆیە، حەسەن فەلاح لە رەسمەکانیدا گەشبین بوو، داهاتووی گەشاوەی کوردستانی رەسم دەکرد و دەیویست گەشبینی و کامەرانی بچەشێنێتەوە دڵی خەڵک.

## بیروڕای نووسەر و هونەرمەندانی گەورە لەبارەی حەسەن فەلاح

حەسەن فەلاح، کە یەکێکە لە پێشڕەوەکانی هونەری شێوەکاریی کوردی، زۆر پابەندی شێوەی شتەکان و بەرجەستەکردنیانە. وات لێدەکات کە بەرامبەر ئەو شتانەی رەسمیان دەکات ـ لەناویاندا ئەک لە دەرەوەیاندا ـ رابچڵەکێیت. جەمال رەشید: رۆشنبیریی نوێ، ١٩٧٤

حەسەن فەلاح بە یەکێک لە یەکەمین ئەو هونەرمەندانە دەژمێردرێت کە هونەری نیگارکێشانیان لە کوردستاندا دامەزراندووە.ئازاد شەوقی

حەسەن فەلاح پێشڕەوە... عەزیز سەلیم

## عەزیز سەلیم ١٩١٥ ـ ٢٠٠٣)

هونەرمەندێکی بلیمەت و داهێنەر
ـ فیصل اللعیبی ٢٢/ ٥/ ١٩٧٢
دفتر الزیارات للفنان، بغداد

ـ لە ١٩١٥ لە گوندی میرزی، لەنێوان پشدەر و بنگرد، لەدایکبووە. دایکی ناوی زێدیت، باوکی ناوی سەلیم بەگی کەلار بووە کە لە ١٩٢٨ یەکەم قوتابخانەی لە کەلار کردۆتەوە.

ـ لە ٦ ساڵییەوە، لە کەلار، بە خەڵووز لەسەر دیواری ماڵ و مزگەوتەکاندا رەسمی کردووە. باوکی، مامۆستای بۆ گرتووە و فێری رەسمی کردووە. ناوی مامۆستاکەی: عەلی فاتح الکاظمی بووە. لە سەرەتادا زۆر رەسمی گیانەوەرانی کێشاوە: ئەسپ و پشیلە و مەڕ و ماڵات.

ـ یەکەم پیشانگەی تایبەتی خۆی لە ۱۹۳۲ لە قەبرستانی شێخ جەعفەر ( لە خوارەوەی زانکۆی ئێستای سلێمانی) کردۆتەوە ( لەبەرئەوەی نەیانهێشتبوو لە قوتابخانە و هۆڵەکاندا بیکاتەوە). تابلۆکانی، کە بریتی بوون لە ۱۲ تابلۆ، بە قەد کێلەکانەوە هەڵپەساردبوو. پاشان خەلک تابلۆکانیان دراندبوو، ئەویشیان بەردباران کردبوو. مەلا گوتبوویان: (ئەمە شەیتانە پەیدا بووە). تابلۆکان ژیانی لادێ و پۆرترێت بوون، تابلۆیەکیش: دکتۆر شەوکەت زەنگەنە لە حالەتی ددانکێشانی دایکی عەزیز سەلیم دا.
ـ لە ۱۹۳٤ دووەم پیشانگای لە قوتابخانەی گەلاوێژ لە سلێمانی کردۆتەوە. دیسان خەلک نەیانهێشتووە بەردەوام بێت.
ـ لە سالانی ۱۹۳۰دا منالکارە و گەنجی رەسسام هەبوونە، حەسەن فەلاح و عەزیز سەلیم هانیان داون بۆ رەسم. کەلوپەلی رەسمیان لە شۆریجەی کەرکووک و بەغدا کریوە، داویانە پەوان. لە سلێمانی لە چاپخانەی رەشۆل بەیەک دەگەیشتن.
ـ لە سالانی ۱۹۳۳ ـ ۱۹۳٤ لەگەڵ حەسەن فەلاح لە سلێمانی، لەسەر دیواری قاوەخانەکانی نەسحابە سپی (لە جادەی کاوەی ئێستا ) تابلۆ و پۆرترێت دروست دەکەن.
ـ لە ۱۹۳٤ سێیەم پیشانگای لە شاری کەرکووک، لە گەرەکی شۆریجە، لە چاپخانەی یداللە کردۆتەوە. بریتی بووە لە ٦ تابلۆ. هەندێ لە تابلۆکان فەرمانبەرانی شەریکەی نەوتی کەرکووک لێیان کریوەتەوە بە ٤ و ٦ و ۱۰ دینار. هەر لەوێ، ئیبراهیم خەلیل دەناسێت، کە نیگارکێشێکی کوردی خەلکی دووزخورماتوو بووە و عەزیز سەلیمی زیاتر هانداوە بۆ رەسم.
ـ لە ۱۹۳٦، حوسێن حوزنی موکریانی دەناسێت. ئەویش دەیناسێنێ بە دانیال قەصاب (ئەوکاتە مامۆستای قوتابخانەی ئیبن خولەکان بووە) لە هەولێر. لە هەمان سالدا، بە هاندان و پشتگیریی موکریانی، پیشانگایەکی هاوبەش دەکەنەوە لە بالکۆنەکەی قوتابخانەی ئیبن خولەکان. موکریانی ـ خۆی کارتی پرۆپاگاندەیان بۆ چاپ دەکات. عەزیز سەلیم بە ۱۲ تابلۆ و ۲ نەحت بەشدار دەبێت و دانیال قەصاب بە چەند تابلۆیەک، یەک لەوانە منارەی چۆلی بووە. پیشانگاکە ٤ رۆژی خایاندووە.
عەزیز سەلیم لەو تابلۆیانەدا، تراژیدیای ژیانی جوتیارانی پیشان دابوو، یەک لەوانە: ئاغایەک بە قامچی لە پشتی جوتیاران دەدات. سەبارەت بەمە و سەبارەت بەوەیش کە تازە باوکی ئیعدام کرابوو، لەترسی گیران، حوسێن حوزنی موکریانی دەیباتە لای مەلای گەورەی کۆیە و لەوێ، لە مالی مەلا صدیق دەیشارنەوە. پاشان رادەکات بەرەو پشدەر و لەوێشەوە دەچێتە لای جافەکانی ئێران.
ـ لە ۱۹۳۷ تا ۱۹۳۹ لە سلێمانی، بە مەخفیگەری ژیان بەسەردەبات. تێکەڵ بە ژیانی سیاسی دەبێت. لەگەڵ شاکر فەتاح و هەمزە عەبدوللا و عەزیز پشتیوان و رەفیق حیلمی لە حزبی هیوا کاردەکات. لەوکاتەدایە کە تابلۆی شەری بازیان دروست دەکات کە ئێستا لە مالی شێخ دارۆ پارێزراوە.
ـ لە ۱۹٤۳ پیشانگایەکی هاوبەشی بۆ هونەرمەندانی کوردستانی ئێران کردۆتەوە لە شاری مهاباد. هەندێ لە هونەرمەندەکان، ئەمانە بوون: وەلی زادە ( کرمەشان)، خەلیل زادە (مهاباد)،

مەحموود مەحدوور ( مامۆستا بووە و خەڵکی سنە بووە). خۆیشی بەشداریی کردووە.ـلە ١٩٤٤ پیشانگایەکی هاوبەشی دووەمی بۆ هونەرمەندانی کوردستانی ئێران کردۆتەوە لە شاری باکۆ. بریتی بوون لە ١٠ ـ ١٢ هونەرمەند: خۆیشی بەشداریی کردووە.
ـ لە ١٩٤٦ لە کۆماری مهابادا لە وەزارەتی عیلاقاتی خاریجی و فەرهەنگ کاری کردووە. لەگەڵ قازی محەممەد و عبدالرحمن زەبیحی برەویان بە ژیانی رەسم و هونەری داوە.
ـ لە ١٩٤٩ لە تورکیاوە بەرەو ئەورووپا سەرهەڵدەگرێت، شەش مانگ لە پاریس دەمێنێتەوە (لەوێ پیکاسۆ دەناسێت). کە دەچێت بۆ ئەورووپا ناشنایەتی لەگەڵ قوتابخانە تازەکانی ئەورووپا وەک کووبیزم و سوریالیزم.. پەیدا دەکا. ( زۆر شتی نوێم لەوێ دیت، بەڵام شێوازی خۆم نەگۆڕی).
ـ لە ئاخر و ئۆخری زستانی ١٩٤٩ لە پاریس، لە هوتێلێک بە ٣٦ تابلۆ پیشانگایەک دەکاتەوە و ١٠ رۆژ بەردەوام دەبێت. وەزیری دارایی ئەوکاتی فەرەنسا، مسیۆ رێنی، تابلۆیەکی لێدەکڕێت بە ناونیشانی (مردووەکان قسە دەکەن).
ـ تا ١٩٥٦ لە ئەورووپا بووە. لەم وڵاتانەدا پیشانگای کردۆتەوە: فەرەنسا، ئیتالیا، چیکۆسلۆفاکیا، یۆگۆسلاڤیا، لەندەن، ڤیەننا. تابلۆکانی بە تیمزای کوردیش تارت دەناسرێنەوە.
- تابلۆی حەپسەخانی نەقیب لە ١٩٦٩ کراوە، لە مۆزەخانەی بەغدا پارێزراوە.
ـ لە ١٩ی ٥ی ١٩٧٢دا نزار سلیم پیشانگەیەکی نەوی لە بەغدا کردۆتەوە.
- پیشانگەیەکی تایبەتی لە مانگی ٨ی ١٩٩١ لە سلێمانی کردۆتەوە لە هۆڵی کۆمیتەی بەرد بە ١٣٧ تابلۆ بەشداریی کردووە.
اسماعیل فتاح الترک لە دەفتەری یەکێک لە پێشانگاکانی نووسیویەتی: «تۆ بەراستی ئیبتکارت کردووە و شتی تازەت داهێناوە». ( ٣٠ )تابلۆیشی لێ کڕیوە. هەروەها هونەرمەندە عیراقیەکان تابلۆیان لێ کڕیوە و لەسەریان نووسیوە.
تابلۆی شێربازیی ژنان لە لوڤەر پارێزراوە: دوو ئافرەت بە شیر زۆرانبازی دەکەن. دوو ژن لەدیاریان وەستاون. منداڵێک لەملاوە دەگری. تابلۆیەکیشی لە مۆزەخانەی ئەمستردام هەیە: کورد بەفرەخلیسکانێ دەکەن. هەندێ لە تابلۆکانی دیکەیش ئێستا لە واشنتۆن و ریۆدۆژانیرۆ و تفلیس و یەریڤان و کوێت و عەدەن و لبنان و میسر و توونس و جەزائیر پارێزراون.
عەزیز سەلیم لە گەنجەکان پەسەندی ئەبستراکتی مالڤە و بەشارعیسا و مەدحەت و اسماعیل خیاط دەکات. لەباردی جیاوازیی خۆیشی لەگەڵ کلاسیکەکانەوە دەڵێ: جیاوازیی من و کلاسیکی ئەورووپی لەوەدایە کە من بە شێوازی سەرەتایی و فطری کارم کردووە. من بەم سەرەتایی و فطریەتەی خۆم ئیبداعم کردووە، ئیبتکارم کردووە، بەڵام ئەوان تەقلیدیان کردووە. ئەمەش وەک گۆکان و رۆسۆ. تابلۆکانی حەپسەخانی نەقیب، لعبە القدر، زەمبیلفرۆش، سەدەی بیستەم.. نموونەن. هونەرمەندە ئەکادیمییەکان جەنتای خەڵکی دیکەیان هەڵگرتووە، بەڵام من جەنتای خۆمم هەیە.

# حوسێن حوزنی موکریانی

**داهێنی گرافیک و**
**یەکەم نەخشەسازی هونەرمەند**
**لە بەستێنی چاپەمەنیدا**

**حوسێن حوزنی موکریانی، یەکەم نووسەری کوردی نیگارکێش، خاوەن یەکەم وتار و یەکەم کتێب بە زمانی کوردی لەبارەی فۆتۆگراف و هونەری رەسم، بنیاتنەری هونەری چاپ و نەخشەکاری و گرافیک بووە لە کوردستاندا.**

حوسێن حوزنی موکریانی یەکێکە لە یەکەمین ئەو نووسەرە کوردانەی کە لە سەردەمی هاوچەرخدا بایەخی داوەتە هونەری ردسم، رەسم بە هەموو لقەکانییەوە: تابلۆ، نیگار، وێنەگەری ( فۆتۆ)، کۆلێن ( گراڤوور)، زەنگۆگراف، کۆلان بە تیشکی رووناکی...هتد. لە هەمان کاتدا، موکریانی یەکەمین نووسەری کوردە کە خۆیشی نیگارکێش بوود، رەسمی کردووە؛ یەکەمین نووسەریشە کە کتێبەکانی خۆی بە نیگار و تابلۆی روونکاری رازاندۆتەوە. بەردی بناغەی لە بواری بەکارهێنانی تەختیت و نیگار و هونەری هێلکاریی لەناو کتێب و گۆڤار و رۆژنامانداد امەزراندووە.
وەک لە لاپەڕە ۷دا، شاکر فەتاح لە پەرتووکی (داماوی موکریانی. چاپی بەغدا: ۱۹۷۲)، دەلێ: حوزنی موکریانی گەلێک پیشەی بەنرخی دەزانی، لەوانە: چاپگەری، مۆرهەلکەندن، خۆشنووسی، نووسین لەسەر مس و زەرد و شووشە و بەردی نرخدار و دار، مۆری لاستیک، زەنگۆگراف، وێنەگەری و کلێشە هەلکەندن.

## یەکەمین نووسەری کوردی نیگارکێش

موکریانی یەکەمین نووسەرە کە کتێبەکانی خۆی بە نیگار و تابلۆی روونکاری رازاندۆتەوە و بەردی بناغەی لە بواری بەکارهێنانی تەختیت و نیگار و هونەری هێلکاریی لەناو کتێب و گۆڤار و رۆژنامانداد امەزراندووە. کتێبی کوردیی چاپکراو، پێش موکریانی، خالین لە رەسم و نیگار و تابلۆی روونکاری.

یەکەم کتێبی کوردی لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیی هاوچەرخدا کە وێنە و نیگاری تێدا بلاوکرابێتەوە بریتیە لە کتێبێکی ح. ح. موکریانی بە ناونیشانی غونچەی بەهارستان کە لە سالی ١٩٢٥ لە چاپخانەی زاری کرمانجی لە رواندز بلاوکراوەتەوە. ئەم کتێبە زیاتر لە بیست نیگار و ئەختیتی لەبارەی کورد و ولاتی کورد و سەرکردە مێژووییەکانی گەل، لەگەل چەند نەخشەیەکی جوگرافی، تێدا بلاوکراوەتەوە. هەروەها کتێبەکانی (وێنەگەری و کولین)، (خۆشی و ترشی)، (مەرۆکە و بزنۆکە) لە سالانی بیست و سییەکاندا، پرن لە وێنە و تابلۆ و هێلکاری و وێنەی روونکاری. ئەم کتێبە ناوبراوانە گەواهیدەر و بەلگەیەکی دیاری ئەوەن کە موکریانی چ نیگارکێشێکی بەهرەمەند و خاوەن توانا بووە.

حوسێن حوزنی موکریانی، کە یەکێک لە یەکەم چاپخانەکانی، لە ئەلمانیا و حەلەبەوە هێناوەتە کوردستان، خۆی مۆرهەلکەنێکی چاک بووە، لە هەمان کاتدا شارەزاییەکی تەواویشی لە بواری چاپخانە و چاپکردنی کتێبدا هەبووە، چێژێکی تایبەتی هەبووە بۆ وێنە و تابلۆ و نەخش و نیگار. هەستی بەوە کردووە کە وێنە و نیگار و تابلۆی رونکاری باشتر بیر و باوەری نووسەر دەردەبرن و گەیاندنی بیر و تێگەیشتن ئاسانتر دەکەن: بۆیە لە بەرهەمەکانیدا بەردەوام بەکاری هێناون.

## یەکەم وتاری ئەرخانکراو بە زمانی کوردی لەبارەی رەسم ١٩٢٨

دووای شێخ نووری شێخ سالح، حوسێن حوزنی موکریانی یەکێکە لە یەکەم ئەو نووسەرە کوردانەی وتاریان لەبارەی رەسم و هونەری نیگارکێشان لە گۆڤارەکاندا بلاوکردۆتەوە و ویستوویانە رۆشنبیرییەکی شێوەکاری و ئیستاتیکای رەسم لەناو کورداندا بلاوبکەنەوە.

لە لاپەرە ١٦ای ژمارە (١٢)ی گۆڤاری زاری کرمانجی دا لە رۆژی ٢٥ک٢ ی سالی ١٩٢٨دا، موکریانی پرۆپاگاندەی بۆ پەرتووکی (ترازان) کردووە، کە لە بلاوکراوەکانی زاری کرمانجی یە دەلێ:

ترازان سەد و یازدە سەربهوردی واقیعییە نەک خەیالی لەسەر لەهجەی شیمال. بە مناسەبەتی هەر سەربهووردی رەسمێکی تێدایە، بۆ لاوانی مەکتەب زۆر بەکەلک و باشە.

هەروەها لە هەمان شوێندا پرۆپاگاندەی بۆ پەرتووکی (خێوەی رازان) کردووە، کە لە بلاوکراوەکانی زاری کرمانجی یە، دەلێ: خێوەی رازان کتێبێکی سەد و چل حیکایەتی خەیالییە نەک واقیعی لەسەر لەهجەی جنووبییە. بە مناسەبەتی هەر حیکایەتی رەسمێکی تێدایە، لە طەرەف میرزا حەسەن کوردستانی تەرجەمە و رێکخراوە. ئەسەرێکی گەلەک چاک و بە قازانجە. بە لاوانی رێزی ٤ و ٥م.

هەموو ئەم وێنانە، واپێدەچێت موکریانی خۆی دروستی کردبن. یان هەر هیچ نەبێ، موکریانی بیری دانانی ئەم رەسمانەی بۆ ناو کتێب بە خەیالدا هاتووە و ئەو ـ خۆی دایناون.

لە لاپەرە ١٠ ـ١٢ای ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری زاری کرمانجی دا لە رۆژی ١٧ی ئۆگەستی ١٩٢٩دا، لە وتاری (مێژووی عەکاسی و فرووعاتی) دا بایەخدانی کوردان بە هونەری رەسم و نیگارکێشان لە سەردەمی پێش ئیسلامدا روونده‌کاتەوە و دەلێ:

لە عەسری پێش ئیسلامدا کوردەکان خانوویەکی تاریکیان دروست دەکرد، کونێکی چکۆلەیان

تێدا دەهێشتەوە. پیاوێکی عەکسیان وەرگرتبایە، لەبەر ئەو کونەیان دوور رادەگرت. رەسسام لە رۆژی ئەو خانووەدا رەسمی دەخستە سەر چتێکی مەطلوب و بە قەلەم خەریکی دەبوو...

هەروەها لە ژمارە (٣)ی زاری کرمانجی دا، لە سالی ١٩٢٨، وتارێکی لەباردی هونەری گرافیک و رەسمکردن بەشێوەی کۆڵین بە ناونیشانی (عەکاسی کۆڵان) نووسیوە و ئەم زاراوە تازانەی بۆ یەکەم جار لە زمانی کوردیدا بەکارهێناوە: رەسمی نەضەری، مصەوەری مەشهوور، عەکس، صنعەتی چاپ و کلێشە، چینکۆگرافی، لیثۆگرافی، فۆتۆگراف.

## یەکەم کتێب بە زمانی کوردی لەبارەی هونەری فۆتۆگرافی و نیگارکێشان ١٩٣٤

حوسێن حوزنی موکریانی لە ٥ای کانوونی یەکەمی سالی ١٩٣٤دا، لە چاپخانەی زاری کرمانجی (زنجیرەی ژمارە ٢٠) لە رواندز یەکەم کتێبی سەربەخۆی بە زمانی کوردی لەبارەی هونەری گراڤوور و رەسمکردن و وێنەگەری بەناونیشانی (وێنەگەری و کۆڵین) بلاوکردەوە. ئەم کتێبە، تەرخانکراوە بۆ باس و لێکۆڵینەوە لە هونەری رەسم و گراڤوور.

لەم کتێبەدا، بۆ یەکەمین جار نووسەرێکی کورد ناوەرۆکی هونەری رەسمکردن و لقەکانی ئەم هونەرەمان بۆ شێدەکاتەوە. بایەخی هونەری گرافیک و نیگارکێشانمان بۆ لێکدەداتەوە، بۆئەوەی پەیرەوی بکەین و لاسایی بکەینەوە: لە کتێب و نووسراوەکانمامدا و لە کاتی پێداویستییەکانی ژیانی چاپ و نووسین و رۆشنبیریماندا بەکاری بهێنین. ئەم کتێبە، بەرگەکەی بریتیە لە تابلۆی ژن و پیاوێکی کورد کە بە جلوبەرگی کوردییەوە دانیشتوون مەژوولی رەسمکردن و هەڵکۆڵینی نیگارن. تابلۆکە بە مووقەڵەم، بە مەرەکەبی چینی کراوە. حوسێن حوزنی ـ خۆی رەنگاندوویەتی. کتێبەکە، وێنەیەکی فۆتۆگرافیی نووسەر و ٢٥ تابلۆی تەختیتی تێدایە کە ئامێرەکانی نیگارکێشان و لیتۆگرافی و گراڤوور و زەنگۆگرافی و فۆتۆگرافی پیشان دەدات. ئەم تابلۆیانە دەسکردی حوسێن حوزنی ـ خۆین.

موکریانی کۆمەڵێک زانیاریی بەسوودمان لەبارەی قۆناغ بە قۆناغ چۆنیەتیی رەسمکردن، وێنەگەری، لیتۆگرافی، زەنگۆکراف، هەڵکۆڵین بە تیشکی رووناکی، پێشکەش دەکات. (٢٢) بەم لێکۆڵینەوەیەش، سەدان زاراوەی زمانەکانی ئەورووپای بۆ یەکەمین جار خستۆتە ناو زمانی کوردییەوە و زمانەکەمانی لە بواری زاراوەسازیدا و لە بواری بەکارهێنانی زاراوەی هونەریدا دەوڵەمەند کردووە. هەموو ئەم زاراوانەی خوارەوە، بۆ نموونە، یەکەمین جارە دەکەونە ناو زمانی نووسینی کوردییەوە: وێنەگەری، زەنگۆگراف، فوتوغراف، ئالەتی نیگارکێشان، وێنەهەلقەندن، کۆڵانی بە تیشک، فۆتۆگراڤیور، کۆلۆدیۆن، چوارچێوە، شووشەی بە هەست، ئاودنگ، دەرمانی گیراوە، دووربین، فەنەر، نەخشە، رەحەتی، سانتیمەتر، غرام، ئەسپرتۆ، تواوە، تیرۆک، قەڵەمی رتووش، فلچە، کلێشەدان، رەندە، قالب وەرگرتن، بەتاریەی ئەلەکتریک، مەرەکەبی تەڕ، لیتۆگرافی، ئاوێنە...

**موکریانی لە پێشەکیی کتێبەکەیدا، لە لاپەڕە ٢دا دەڵێ:**

"لە وەختی کەران و سووڕانەوەم بە دیاری بیانیاندا وردە دەبوومەوە، خۆمان و بیانیانم دەکەوتە

بەرچاو. بەدبەختـانە خـۆمـانم لە صنعـەت و فـەن دا پاشكەوتوو دەدیت. پیشـەی منیش چونكە مۆركۆڵان بوو، لەسـەر خۆم بە پێویست زانی فـەننی كلـیشـەكۆلی بە رووناكی فـێـر بم. بۆ ئەوە گەلێكم تەقەڵا دا و كۆششم كرد كە دیارییەكی بۆ دیاریم دیار بێ و دەسـتی خەم. یەكەمین جار لە ئەستەمبوڵ لەلای ئەڵمانەكان بەهۆی كوردەكانەوە ڕێگەی ڤـیل و فۆتۆلیتۆگراف فێربووم. لە حوجاز و شام و حەلەب بەو جۆرە كارم دەكرد، بەڵام ناتەواو بوو. لە مەطبەعەی مارۆنییەكەی حەلەب، لەلای مودیرەكەی، كە سەلیم مطر ئەفەنی بوو كۆششم كرد و نزیك سی لیرە دراوم خەرج كرد و ڕێگای ڤیلم سەرخست. بەهۆی چەند كوردێكی مصرەوە، ئوستاد شەریف، ئوستادی بەیرووت، نزیك سەد لیرە ئیستفادەی لی كردم: ڕێگای دووەمینی كۆلۆدیۆن و هەستی فێركردم. بەوەش كار نەكەوتە پێش، لە بەیرووت لەلای طاهر تنیر، لە شام لەلای حناوی، لە مصر لەلای ورشە المصریە و لە پاریس لەلای خاوەندی ( دی پاریزیان) لەم فـەننەدا پێـیـان گـەیاندم و منیش بە زانین و تاقیكردنەوە كردمە كتێب. بەبێ ئەزیەت شاگرد فێر نەكا و بۆ میللەتەكەم بەكاردێ".

وەك لەم پێشەكییەدا دەردەكەوێ، موكریانی زیاتر لە سەد و سی لیرەی لە باخەڵی خۆیەوە خەرج كردووە و دەیان وڵات گەڕاوە تا فێری ئەم هونەر و پیشە شارستانییە بووە و توانیویەتی ئەم كتێبە بنووسێ: لە ئەستەمبوڵ لەلای ئەڵمانەكان، لە حوجاز و شام و حەلەب، لە بەیرووت، لە مصر لەلای ورشنە المصریة و لە پاریس.

ئەم كـتـێبـەی مـوكـریانی، بۆ وێنەگر و خاوەن سـتۆدیۆی وێنەشوشتنەوە، بۆ نیگاركێش و هونەرمەندانی بواری ڕەسـمكردن و گـرافیك، تەنانەت بۆ خاوەن چاپخانەكانیش سوودێكی لەبن نەهاتووی هەیە. واتێدەگەم هەمـوو خـاوەن چاپخـانەكانی دوای ئەو، بە گـیـوی مـوكـریانیشـەوە، سوودیان لەم كتێبەی حوزنی موكریانی دیبێت بۆ بەكەرخستنی چاپخانەكانیان و هەڵكۆڵینی ڕەسم و نیگارەكانیان. بێگومان بۆ دامەزراندنی یەكەم ستۆدیۆكانی وێنەگرتنیش لە كوردسـتـاندا دەبێ سوود هەر لەم كتێبە وەرگیرابێ.

جگە لەمانەش، وەك لە چاوپێكەوتنێكی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ عەزیز سەلیم كە لە مـانگی ئوكتۆبەری ساڵی ١٩٩٧دا سازماندراوە، عەزیز سەلیم باسی ئەوە دەكات كە ح. ح. موكریانی هانی عەزیز سەلیمی داوە یەكەم پیشانگای خۆی بكاتەوە. هەر ئەویش بووە كە عەزیز سەلیم و دانیال قـەصابی لە سـاڵی ١٩٣٦ لە هەولێر بەیەكـتـری ناسـاندووە و لە هەمـان سـاڵدا لە باڵكۆنەكەی قوتابخانەی ئیبن خولەكان لە هەولێر پیشانگایەكی هاوبەشی بۆیان كردۆتەوە و هەر خۆیشی كارتی پڕۆپاگـاندەی پیشـانگاكـەیانی بۆ چاپ كـردووە و پیشـانگـاكـە ٤ ڕۆژی خایاندووە. ئەمـە ئەوە دەگەیەنێ كە ناوبراو لە هەمان كاتدا كە نیگاركێش بووە، پشتیوانیی نیگاركێشـەكانی دیكەش بووە و ویستوویەتی جموجۆڵی شێوەكاری بەرەو پێشەوە بڕوات.

بەم شـێـوەیە، بەرهەمـەكـانی مـوكـریانی لە بواری ڕەسم و نیگار و تابلۆ و زەنكۆگـراف و گـرافـووردا، لە هەر دوو ئاستی لەسـەرنووسین و بەرهەمـهـێناندا، بەردی بناغـەی بایەخدان بوو بە هونەری ڕەسم ونیگار لە كـوردسـتـاندا و تەكـانێكی گـەورەی دایە بڵاوكـردنەوەی هونەری ڕەسم و وێنەكێشان لەناو هونەرمەند و نووسەر و ڕووناكبیرانی كورددا.

# خالد سەعید

## ریالیستێکی ڕۆمانسی

**خالد سەعید، دووای دانیال قەصاب و حەسەن فەلاح و عەزیز سەلیم، دەکەوێتە ڕیزی ئەو هونەرمەندانەی کە لە ساڵانی ١٩٥٠ بەملاوە دەکەوێتە کار: بەرەوپێشەوەبردنی چەمکی نیگارکێشان و تەکانپێدانی هونەری ڕەسم لە کوردستاندا.**

خالد سەعید، بەراستی، هونەری ڕەسم لە (خۆڕسکی) و (سادەیی) و واقیعیەتی فۆتۆگرافی ڕزگار دەکات و دەیگەیەنێتە ئاستێکی هونەریی باڵاتر، بەتایبەتیش لە ساڵانی پەنجا و شەستەکاندا. ئەمە جگە لە داهێنانە تایبەتییەکانی خۆی لە بواری سینۆگرافی و دیکۆرسازیی تەلەفزیۆنی و شانۆییدا، کە دووای دانیال قەصاب، یەکەم هونەرمەندە لەم بوارەدا. ناوبراو پێش هەمـوو هونەرمەندێکی کورد توانیویەتی دەستی خۆی بگەیەنێتە ئەورووپا و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سوود لە کولتوور و هونەری ڕەسمی ئیتالی و ئەڵمانی بدینێت و لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگ بداتەوە. بە یەکەمین هونەرمەندی کورد دەژمێردرێت کە پردێکی لەنێوان هونەریی شێوەکاریی ئەورووپا و کورد دروستکردبێت. ئەمەش لە ساڵی ١٩٥٨ بەملاوە، واتە پێش چوونی محەممەد عارف بۆ مۆسکۆ بە چەند ساڵێک.

خالد سەعید لە ١٩٢٧ لە گەڕەکی دەرگەزێن لە سلێمانی لەدایکبووە و لە١٩٩٦دا کۆچی دوایی کردووە. قوتابخانەی فەیسەڵیەی سلێمانیی تەواو کردووە. لەژێر چاودێریی مامۆستا و هونەرمەندی شێوەکار، فوئاد ڕەشید بەکر کە ئینگلیزییەکی باشی زانیوە، فێری هونەر بووە و زۆر هانی داوە بۆ نیگارکێشان، تا لە ١٩٥٣ دەچێتە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا/ بەشی وێنەکێشان و لە ساڵی ١٩٥٥ـ ١٩٥٦دا تەواوی دەکات و هەمان ساڵ دەگەڕێتەوە سلێمانی و لەوێ بۆ ماوەی دوو ساڵ دەبێتە مامۆستا. لە ١٩٥٨ لەگەڵ شاندێک بۆ خوێندن دەنێردرێتە ئیتالیا و لەوێ ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی ڕۆما بەشی (سینۆگرافیا) لە ساڵی ١٩٦٣ تەواودەکات و لە ١٩٦٤ دەگەڕێتەوە بەغدا: لە مانگی

ئۆگەستی ١٩٦٤ لە تەلەفزیۆنی بەغدا بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک لە بەشی دیکۆر کاردەکات و دەیان کاری هونەری دەکات. پاشان دیسان دەنێردرێت بۆ تەلەفزیۆنی ئەڵمانیای دیموکرات و لە هەمان بەشدا کاردەکات. لەوێ بڕوانامەی (ئارت دایرەکشن)ی پێ دەبەخشن. ئنجا کە دێتەوە بەغدا، ئەم جارە دەینێرن بۆ لیبیا بە مەبەستی دامەزراندنی تەلەفزیۆنی لیبیا و هەڵسووڕاندنی. دوای ساڵ و نیوێک لە لیبیاوە لەڕێگەی ڕۆماوە دێتەوە بەغدا و تا ١٩٨٧ لەوێ لە تەلەفزیۆن کاردەکات.

ناوبراو زمانی ئینگلیزی و ئیتالی و ئەڵمانی و فارسی و عەرەبیشی زانیوە.

چەندین دیکۆری بۆ چەندین شانۆگەری لە سلێمانی، هەروەها بۆ شانۆگەرییە کوردییەکانی تەلەفزیۆنی کەرکووک و بەغدا دروست کردووە. خۆی دەڵێ:

«لە دیکۆر و شینۆگرافیی ١٤٤ تەمسیل و بەرهەمی تەلەفزیۆنیی کوردی کارم کردووە». ئەمە جگە لە دەیان دیکۆر و بەرهەمی هونەریی دیکەی ئەم بەستێنە بۆ تەلەفزیۆنەکانی بەغدا و لیبیا و ئەڵمانیای دیموکرات.

خەڵاتی پێشانگەی پیشەسازی ـ کشتوکاڵی لە سلێمانی وەرگرتووە لە مانگی ٨/ ١٩٥٦دا. یەکەم عیراقی بووە کە بە زەمالە بچێتە ئەڵمانیا و دیپلۆمی دیکۆریست وەربگرێ.

خالد سەعید لە مانگی ٧/ ١٩٥٠دا لە سلێمانی لە هۆڵی سانەویی سلێمانی، دیکۆری بۆ شانۆگەریی هاملێتی شکسپیر، ئامادەکردن و دەرهێنانی: مەجید ڕەشید (کە هونەرمەندێکی شێوەکار بووە) دروستکرد کە لەلایەن قوتابیانی سەر بە پەروەردەی سلێمانی پیشاندراوە. ئنجا لە ١٩/ ١١/ ١٩٥٧دا، بە هاوکاریی ئازاد شەوقی، دیکۆری بۆ شانۆنامەی تاوان و تۆڵە، نووسراوی نووری وەشتی، دەرهێنانی: ئەنوەر تووفی دروستکردووە کە لەلایەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان لە سلێمانی پیشاندراوە. ڕۆژنامەی ژین ژمارە ١٣٦٥ ی ڕۆژی ٧/ ١٠/ ١٩٥٧ و ژمارە ١٣٤٤ی مانگی نۆڤەمبەری ١٩٥٧ باسی کردووە و ڕەخنەی لێگرتووە.

هەروەها لە ١٩/ ٦ /١٩٥٧دا بەشداریی کردووە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی. دەستەی دامەزرێن: فوئاد ڕەشید بەکر، شەفیقە سەعید، ڕەفیق چالاک، نووری محەمەد ئەمین، محەممەد سالح دیلان، ئازاد شەوقی، خالید سەعید، ولیەم یۆحەننا، مستەفا سالح کەریم. ئەمە یەکەم تیپی شانۆیی و نیگارکێشانی مۆڵەت پێدراوی سلێمانییە. یەکەم هەڵبژاردنی گشتی لە ٥/ ٧ /١٩٥٧دا کراوە. کرانەوەیشی لە ١/ ٨دا بووە. ڕۆژنامەی ژینی ژمارە ١٣٥٥ ی ڕۆژی ٨/ ٨ /١٩٥٧ لەسەری نووسیوە. کۆمیتەی وێنە و کۆڵین: ئازاد شەوقی، خالید سەعید، جەمال بەختیار.

هونەرمەند گەلێک بیروبۆچوونی هونەرییانەی تازەی هەبووە لە بواری دیکۆرکێشاندا. بەتایبەتی لەو ڕۆژەوەی کە لە ئیتالیاوە گەڕایەوە و لە تەلەفزیۆنی بەغدا دەستی بەکارکرد. لە کارەکانیشیدا بە بۆیەی ڕۆنی و پاستیل ئنجا دواتریش کە بۆیەی ئاوی پەیدا بوو، بەکاری هێناوە.

خالید سەعید یەکەم پێشانگای تایبەتی خۆی لە هۆڵی مەکتەبەی عامەی هەولێر لە ١٩٥٠ ـ ١٩٥١دا کردەوە (پێش پێشانگای هەولێرییەکان) کە بریتی بوو لە تابلۆ و وێنەی فۆتۆگرافی. پێشانگەیەکی تابلۆ و وێنەی فۆتۆگرافیی دیکەی لە هەمان ساڵدا لە سلێمانی (لەناو قوتابخانەی فەیسەڵیە) و لە کەرکووک کردۆتەوە کە بەشی زۆری تابلۆ و وێنەکان بریتی بوون لە وێنەی ژیانی کوردەواری و بەشێکیشیان ژیانی ئەورووپا. تابلۆ و بەرهەمەکانی، ئەمڕۆ، بە دەگمەن دەست دەکەون. کۆمەڵێک تابلۆی لەلای عبدالرحمن زەبیحی هەبوون.

لە کۆتایی ژیانیدا هاوڕێی کلۆدیا کاردینالی و سۆفیا لۆرین بووە. دەزگیرانێکی ئیتالی هەبووە، بەڵام باوکی کچەکە ڕازی نەبووە بیهێنێتەوە بۆ کوردستان.

# جەواد ڕەسووڵ ناجی
## (١٩٢٢ ـ ١١/ ١١/ ١٩٧٥)

یەکەم پەیکەرتاش و یەکەم دەرهێنەری شانۆیی لە هەولێرنیگارکێش، نەخشەکێش، نەکتەر، دیکۆریست، مامۆستای پەروەردەکار.

ـ لە ١٩٢٢ لە گەڕەکی بێراغا لە کۆیە لەدایکبووە.
ـ لە ١٩٢٧ چۆتە قوتابخانە. دوو مەرحەلە پێش جابیر پیرداودی پەیکەرتاش خوێندوویەتی.
ـ لە ١٥ / ١٠/ ١٩٣١دا. بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا، لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا، چۆتە سەر شانۆ و بەشداریی لە شانۆگەریی نیرۆن دا کردووە لە ڕواندز.
ـ لە ١٩٤١ لە هەولێر ناوەندیی تەواو کردووە و چۆتە بەغدا بۆ خوێندن لە دارالمعلمینی بەغدای ئەعزەمیە.
ـ لە ٣٠/ ١٠/ ١٩٤٤ بۆتە مامۆستا لە هەولێر.
ـ لە کۆتایی ساڵانی ١٩٤٠بەولاوە لە لیژنەی هونەریی ڕەسم دا بووە لە قوتابخانەکانی هەولێر، سەرپەرشتیی ڕەسمکردنی قوتابیان و کردنەوەی پێشانگە و چالاکییە هونەرییەکانی کردووە.
ـ لە ١٩٥١ ـ ١٩٥٢ لە هەولێر چەندین شانۆگەریی دەرهێناوە و بەشداریی تێدا کردووە، لەوانە عوتەیل.
ـ لە ١٩٥٢ لە ئامادەیی هەولێر، لە جێی محافەزەی ئێستا، بۆتە مامۆستای ڕەسم. دەرسی ڕەسم و مۆسیقا و هەڵپەڕکی و هونەرە دەستییەکانی دەدایەوە. لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا دەرسی بە چەندین قوتابیی وەک سلێمان شاکر و محەمەد عارف داوە کە ئەمڕۆ هونەرمەندی گەورەن.

ـ له ١٩٥٢دا سەرپەرشتیی پێشانگەیەکی گەورەی قوتابیانی کردووە، کە یەکەم پێشانگەی هاوبەشی قوتابیانی هونەری رەسم بووە لە هەولێر. یەک هەفتە درێژەی کێشاوە، لە مەدرەسەی خەنسای نیستا، هەموو قەزا و ناحیەکان بەشدار بوون: لەم پێشانگەیەدا بەرهەمی قوتابیان پیشان دراوە، کاری نەقلکراو، واتە بەرهەمی قوتابیانی وەک ئەدوەر ولیەم، جلال مدحت خۆشناو، سوداد عەتاولاغا و مراد عەتاولاغا کە ئەوکات رەسسام بوون. ئەم پێشانگایە،، کە بە پێشنیار و کۆششی خۆی ئامادە کرابوو، بە بۆچوونی مامۆستا سلێمان شاکر، شوێن پەنجەی مامۆستا جەوادی بەئاشکرا پێوە دیار بوو. لەوە بەدووا ئیتر کردنەوەی پێشانگەی رەسم لە هەولێر بووە عادەت. مدیر تەربیەی ئەوسات عبدالمجید حەسەن بوو. ئەوکاتە( ١٩٥٢) سلێمان شاکر لە ٣ی متوسطە قوتابی بووە لە اربیل اولی و لە ثانویە جەواد رەسول ناجی مامۆستایان بووە.
ـ لە ١٩٥٨ بە وەفد، لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی دیکەی شاری هەولێر ( جابیر پیرداود، محەمەد عارف، سلێمان شاکر..) نێردرانە ڤیەننا.
ـ لە ٣١/ ١٠/ ١٩٦١ لەگەڵ هونەرمەندان ئازاد شەوقی و جابیر پیرداود، بۆتە ئەندامێکی مرکز وسائل الایضاح لە هەولێر.
ـ لە ١٩٦٣، بۆ ماوەیەکی کورت لەسەر هەڵوێستی نیشتیمانپەروەرانەی گیرا.
ـ لە ١٩٦٤ بەولاوە لە دارالمعلمین لە هەولێر دەرسی هونەری گوتۆتەوە.
ـ لە ١٩٧١ تووشی نیوە ئیفلیجی هات.
ـ لە ١٣/ ٣/ ١٩٧١ تەقاویت کرا و لە ماڵ کەوت، تا لە ١١ ١١ ١٩٧٥دا کۆچی دوایی کرد.

جەواد رەسوول ناجی، کە ماڵەکەیان ( لەگەڵ هەر دوو براکەی: حەسیب و فوئاد) لە گەڕەکی عەرەبان بووە لە هەولێر، لە ساڵانی ١٩٤٥ ـ ١٩٦٣دا، مەرسەمێکی گەورەی لە ماڵەوە هەبووە. هەموو ئەم هونەرمەندانەی خوارەوە هاتوچۆی مەرسەمەکەی ماڵی ئەویان کردووە و لە مەرسەمەکەی ئەودا ئیشیان کردووە و پێ گەیشتوون: جابیر پیرداود، تاهیر پیرداود، ئەدوەرد ولیەم، فوئاد رەسوڵ ناجی، جەلال مەدحەت خۆشناو، سوداد عەتاولاغا و موراد عەتاولاغا، ئەدوارد سەلیم، حەسیب رەسوول ناجی، هەروەها ئەسکەندەر عوسمان (کە ئەو کاتە مامۆستای ئەربیل نوولا بووە).

ناوبراو مامۆستای گەلێک لەو نیگارکێشانە بووە کە ئەمڕۆ بە پێشڕەوی هونەری رەسم لە کوردستانی عیراق دەژمێردرێن، لەوانە: سلێمان شاکر، ئازاد شەوقی، محەمەد عارف، محەمەد مەولود، ئەسکەندەر عوسمان.

بە پێی گێڕانەوەی مامۆستا سلێمان شاکر، لە کۆڕەکەی خۆیدا لە گەلەریی ئەربێللا لە هاوینی ١٩٩٦دا، جەواد رەسوول ناجی کاتێ بەرهەمی سلێمان شاکری دیوە، هانی داوە و داوای لێکردووە کە بێتە لیژنەی هونەریی رەسم لە ساڵی ١٩٤٨ ـ ١٩٤٩دا، ئەو کاتە سلێمان شاکر لە یەکی متوسطە بووە. جەواد رەسوول ناجی سەرپەرشتیی دەکردن بۆ رەسم کە ئەو کاتە رەسمکردن، بە بۆچوونی سلێمان شاکر، زیاتر نەقلکردن بووە.

جەواد دوو برای هەبوو: فوئاد ( کە لە کۆتایی ژیانیدا تێکچووبوو) برادەری جابر پیرداود

بووە و لە یەک مەرحەلەی خوێندن بوونە، رەسام بووە، تابلۆیەکی فوئاد لای جابر پیرداود هەیە. براکەی تریشی، کە ئەویش هەر رەسام بووە: حەسیب.

بەرهەمەکانی (پەیکەر وتابلۆ و تەختیت) ـ تەنیا ئەوانەی ماون و بەر دەستمان کەوتوون، یان کە خۆمان بینیومانن، ئەمانەن:

ـ سێ پەیکەری بچووکی (کچێک)، (سەگێک)، (ئەسپێک) لە ماڵەکەی خۆیان پارێزراون.

ـ کۆمەڵێک تەختیتی قەڵەم رەنگی، لە ئەلبومێکدا، لای کچەکەی، ئاراس خان، کە فەرمانبەرە لە دەزگای کتێب لە زانکۆی سەلاحەددین، پارێزراون.

ـ دوو نەخشەی جوگرافیای ئەورووپا و جیهان، لەسەر دار کراوە بە تەخریم. لە ماڵی خۆیان پارێزراون.

ـ تابلۆی منارەی چۆلی، لە ماڵی دکتۆر عبدالغفار الصائغ پارێزراوە.

ـ پەیکەری کۆتری ئاشتی، لە هەولێر لە کۆتایی ساڵانی پەنجاکاندا، کە بە هاوکاری لەگەڵ جابیر پیرداود دروستیان کردووە.

ـ پەیکەری کورد و عەرەب، بە هاوکاریی جابیر پیرداود لە سەرەتای ساڵانی ۱۹۷۰دا دروستکرابوو، تا کۆتایی ساڵانی ۱۹۷۰ش لە گەرەکی تەیراوە مابوو.

ـ پەیکەری وەرزشەوانەکانی سەر دیواری مەلعەبی هەولێر، بە هاوکاریی جابیر پیرداود، لە ناوەراستی ساڵانی ۱۹٦۰.

ـ نەخشەیەکی رەنگاورەنگی عێراق، لەسەر بەرد هەڵکۆڵدراو، لەسەر دیواری ئامادەیی کوردستان لە هەولێر، لە کۆتایی پەنجاکاندا دروستی کردبوو.

ـ تابلۆیەکی گەورەی، تا ساڵانی حەفتاش، لە ئامادەیی هەولێر هەڵواسرابوو.

ـ چەند تابلۆیەکی دیکەی، لە ماڵی کەلسووم عەللاف و فەوزی حەمدی و مامۆستا شەعلان و نەجم وادی پارێزراون.

تێبینی: زۆربەی بەرهەمەکانی دروستی دەکردن، هاورێ و ئاسیاوەکانی دەیانبرد. هیچی ئەوتۆی نەماوە: تەنیا ئەوانە نەبێ کە باسمان کردن.

هونەرمەند لە تابلۆکانیدا پابەندی سروشت و واقیع، بەشێوازێکی ریالیستانەی زۆر سادە و رووکەش کاری دەکرد. لە سنووری رێبازی واقیعیەتێکی ساکار و فۆتۆگرافی دەرنەدەچوو. بۆیە هیچ دەستاوەردێکی شەخسی و تازەی نەهێنایە مەیدانی نیگارکێشان. بەڵام، سەرەرای ئەمەش، رۆڵێکی گرنگ و کاریگەری بینیوە لە بەرەوپێشەوەبردنی جموجۆڵی رەسم و شێوەکاری لە کوردستاندا و بەتایبەتی لە شاری هەولێر. ئەگەر ئەو نەبووایە لە ساڵانی ۱۹٤۰ ـ ۱۹٦۰دا، لەوانە بوو گەلێک لەو هونەرمەندە گەورانەی هەولێر کە لە ساڵانی ۱۹٦۰ و ۱۹۷۰دا هاتنە مەیدان، دروست نەبوونایە.

لە سەرەتادا ـ وەک زۆربەی نیگارکێشە کوردەکانی دیکەی سەردەمی خۆی ـ تابلۆی هونەرمەندە بێگانەکانی کۆپی دەکرد (نەقل)، پاشان رووی کردە واقیع، ناواخنی تابلۆکانی لە ژیانی کوردەوارییەوە وەردەگرت. بەشی زۆری ئەو تابلۆیانەشی بریتی بوون لە سروشتی کوردستان و پۆرترێت. کەم پاستێل و بۆیە و ئاو، زیاتر پێنووسی رەنگی بەکاردەهێنا. کەرەستەکانی

ڕەسمکردنی جەواد، وەک هونەرەکەی، لە قۆناغێکی سەرەتاییدا بوون.

خەت و فیگەرەکانی جەواد، لاواز و رووکەش، وەک شێوازی بەکارهێنانی رەنگەکانی، لە چوارچێوەی یاسا و کۆتە ئەکادیمییەکان دەرناچن. بابەتەکانیشی، هیچ فەلسەفەیەکی هونەرمەندانەی ئەوتۆیان تێدا پەخش نەکراوە. بەکورتی: جەواد ناجی هێندە ئاگاداری بزووتنەوە شێوەکارییە جیهانییەکانی سەردەمی خۆی نەبووە، وەک تەعبیریەت و کوبیزم و سوریالیزم. تەنانەت نەیتوانیوە سوود لەو کەلەپوورە شێوەکارییە هونەرییە کوردییەش وەربگرێت کە ـ هەر لە سالانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ بەولاوە ـ عەزیز سەلیم و حەسەن فەلاح لە بواری رەسمدا دایانمەزراندبوو. ئەمەش یەکێکە لە خەوشەکانی ئەم نیگارکێشە سەرەتاییەمان.

**بەرهەمە شانۆییەکانی**

**١٥/ ١٩٣١/١٠**

– بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا، لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا، چۆتە سەر شانۆ و بەشداریی لە شانۆگەریی نیرۆن دا کردووە لە رواندز.

– عیززەت حسێن ئەحمەد ئەفەندی، دەڵێ: لە سالی ١٩٣١دا لە رواندز شانۆگەریی نیرۆن پیشاندراوە. کۆمیدیایەکی نۆ پەردە بووە، لەبارەی قومار و دەردە کۆمەلایەتییەکان بووە. دوو رۆژ پرۆڤەیان کردووە. دوو رۆژ بۆ پیاوان، رۆژێک بۆ ژنان بووە. هەروەها دەڵێ: لە ١٩٣١ چووم بۆ رواندز بۆ نیرۆن کە لە رواندز لە ١٩٣١ پێشکەش کراوە. سمایل بەگ و رەزا بەگ و حوسێن حوزنی موکریانی هاتن بینییان. نیرۆن لە ١٥/ ١٩٣١/١٠ نیشاندراوە. تاهیر سادق ئامادەی کردووە و بەشداریی تیا کردووە. وێنەیەکی ئەکتەرەکانی ئەم شانۆگەرییە لە ئەرشیفی محەمەد تەیوور هەیە کە حوسێن حوزنی موکریانیش لەگەڵیان وەستاوە.

ئەکتەر، فوئاد رەشید بەکر دەڵێ: " نووکی شمشێرەکەی نیرۆن بە ئاستەم بەر سەری جەواد رەسوول ناجی کەوتبوو لە رواندز لە کاتی تەمسیلکردندا. لە مالی سمایل بەگی ئاغای رواندز هێنابوومان".

بەرێوەبەری مەکتەبەکەی رواندز فوئاد رەشید بەکر بووە، خەڵکی سلێمانی بووە، شانۆگەریی نیرۆنی دەرهێناوە، دەوری نیرۆن ی بینیوە، دیکۆر و جلوبەرگ و ماکیاژیش خۆی کردوویەتی. سێزدە ئەکتەر دەوریان بینیوە. فوئاد دەوری نیرۆن. ئەکتەرەکانی تر: جەواد رەسوول ناجی ( یازدە سالان بووە، دەوری تەمبوورژەن، عەبایەکی سووری لەبەر بووە و قلنجێکی پێ بووە و تاجێکی لەسەر بووە. قلنجەکەی لە لانێوچەوانی خۆی داوە و ئەزیف بووە، هەر بەردەوامیش بووە لە ئواندن)...هتد. ئامانج: کۆکردنەوەی پارە بووە بۆ کرینی پێداویستییە وەرزشییەکانی قوتابخانە و چالاکییەکانی دیکەی. ئەو کات قایمقامی رواندز رەزا بەگ بووە، ئەمری کردووە کە هەموو خەڵکی رواندز بێن ئەم شانۆنامەیە ببینن.

١٩٥١ ـ ١٩٥٢ : لە هەولێر چەندین شانۆگەریی دەرهێناوە و بەشداریی تێدا کردووە، لەوانە عوتەیل.

١٩٥٤ : ئۆتێللۆی خستە سەر شانۆ لە هەولێر

١٩٥٩: شانۆگەریی هاروونە رەشیدی لە هۆلّی ئامادەیی هەولێر لە هەولێر پێشکەش کردووە، لە نووسین و دەرهێنان و دیکۆر و ماکیاژی خۆی، خۆیشی دەوری هارونە رەشیدی دەبینێ.

**خولیاکانی**

١ـ خۆشەویستیی بۆ گیانەوەران، بەتایبەتی کەر. لایەنگری حزبی کەران بوو لە هەولێر کە لە کۆتایی سالآنی پەنجاوە باو بوو. دوو پۆرترێتیشی بۆ ( کەر ) کردووە.

٢ـ پوول کۆکردنەوە.

سێ ئەلبوومی پوولی زۆر کۆنی ماوە، لە مالّی ئاراس خانی کچی پارێزراوە. لەناو ئەو پوولانەدا پوولێکی سەردەمی شێخ مەحموودیشی تێدایە.

٣ـ زۆر حەزی لە راو بوو. راوچییەکی نیشانەپێک بوو.

٤ـ زۆر حەزی لە وەرزش بوو، فوتبۆلێنی دەکرد. دەرسی وەرزشی داوەتەوە.

**خەلآتەکانی**

ـ خەلآتێکی زیوی شانازی و رێزلێنان، کە خەلآتی دووەم بووە لە فێستیڤالّی رۆژی هونەر (یوم الفن ) لە بەغدا، لە سالّی ١٩٨٥ لەلایەن وەزارەتی پەروەری عیراقییەوە، دووای کۆچی دوایی کردنی، پێی بەخشراوە. خەلآتەکە، دیوێکی: رەسمێکە لەلایەن هونەرمەندی عێراقی، محەمەد غەنییەوە کراوە؛ دیوەکەی تری: دروشمی فێستیڤالّەکەیە، لە لای کاک ئازادی کوڕی، کە لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر فەرمانبەرە، پارێزراوە.

٢ـ چەند باوەڕنامەیەکی هونەری، گرنگترینیان: باوەڕنامەیەکی بەرزی دەولەتیانەیە کە لە مالّی خۆیان پارێزراوە.

هەندێ لە هاوڕێ و قوتابی و ئاشنا هونەرمەندەکانی کە تاکو ئێستا لە ژیاندا ماون و دەکرێ بینە سەرچاوە بۆ کۆڵینەوە لە بەرهەمەکانی، ئەمانەن: جابیر پیرداود، فەوزی حەمدی، محەمەد عەزیز، مامۆستا نەژاد، موفید حوسێن کەسرە، صەفوەت جەرراح، محەمەد عارف، ئازاد شەوقی، سلێمان شاکر، یەحیا مەرجان، کەلسووم عەللاف، محەمەد مەولوود، نەجم وادی، مامۆستا شەعلان، تەلعەت سامان، فەرهاد عەونی، ممتاز حەیدەری.

# بەدیع باباجان
## ۱۹۲۳-۱۹٦۹

بەدیع حسێن باباجان لە ۱۹۲۳ لە کەرکووک لەدایکبووە.
ـ لە ۱۹٥۱ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواوکردووە.
ـ لە ۱۹٦۱ چۆتە سویسرا و بەشی ( تضلیل الخرائط )ی خوێندووە.
ـ فەرمانبەر بووە لە ( مدیریە المساح العام ) لە بەغدا و لە ۱۹۸۰ خانەنشین کراوە.
ـ وێنەی هێڵکاریی شەرەفخانی بەتلیسی و شاعیرانی کوردی کتێبەکەی سەججادی ئەو کێشاوتی. ئەم تابلۆیانەی خۆی بە دڵە: مەلای جەزیری، مەولەوی، بابە تاهیر، فاتمە.
ـ هەموو ئەو هونەرمەندانەی لا پەسەندە کە بە چاوێکی راستی پەروەر و بە دڵێکی پڕ لە هەستەوە رێگەی هونەریان گرتبێتە بەر: لە سەرەتای کلاسیکەوە تا ئەوپەڕی سوریالیزم.
ـ بە یەکێک لە یەکەمین ماموٚستاکانی رەسم و دامەزرێنەرانی هونەری نیگارکێشان دەژمێردرێت لە کوردستانی عیراقدا. بدیع باباجان دراوی عیراقی ی وێنە کێشاوە.
- فایەق حەسەن و جەواد سەلیم و خالد رەحال و شاکر حەسەن ئال سەعید هاوڕێی بوونە و کاری لەگەڵیان کردووە.

## جەمال بەختیار
## جەمال حامد ئەسعەد

ـ لە ١٩٢٧ لە سلێمانی لەدایکبووە.
ـ لە ١٩٤٦ لە کۆماری مهاباد بەشداریی کردووە و پێشەوا قازی محەمەد نازناوی بەختیاری داوەتێ.
ـ لە ١٩٥٧ ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بووە.
ـ نیگارکێشێکی ڕیالیست و خۆشنووسێکی بەتوانا بووە. لە سەرەتای چلەکانەوە دەستی کردۆتە ڕەسمکردن: زیاتر دیمەنی سروشت و ژیانی کوردەواریی، بەشێوەیەکی ساکار و فۆتۆگرافی، ڕەسم کردووە. لە پەنجا و شەست و سەرەتای حەفتاکاندا یەکێک بووە لە نیگارکێشە هەرە دیارەکانی سلێمانی. تابلۆی سەر دەرگای دوکان و قەیسەرییەکان ئەو ڕەسمی دەکردن و دەینووسین.
ـ لە ١٩٧٥ کوردستان جێدەهێڵێ. ئێستا لە ئامریکا سەرۆکی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کوردە. تا ئێستاش لە چالاکی نەکەوتووە.

جەمال بەختیار دەڵێ:

«من لە تەمەنی ٧-٨ ساڵیدا لە تابلۆیەکی حەزرەتی عیساوە عەشقی نیگار بووم. بە خەڵووز لاساییم کردەوە. عەبدولواحید نووری گوتی: وەڵاهی جەمال شتێکی جوانت کردووە». «من و خالید سەعید ڕەسمی ئافرەتمان دەکرد. خۆ زۆر پۆشتەش بوون کەچی خەڵک کە بە لاماندا دەهاتن تفیان لێ دەکردین. تا ئەوکاتەی خالید سەعید توانی وێنەیەک بۆ ڕەفیق حیلمی بکێشێت». «خالید سەعید دیمەنی سروشتی دەکرد و لە من بەتواناتر بوو. زۆر جاران من چاوم لەو دەکرد».

جەمال بەختیار دەڵێ:

«من ڕەفیق حیلمی بەپیر کارە هونەرییەکانمانەوە دەهات و پیشانگەی بۆ سازدەکردین». «وێنەیەکی سەلاحەدینی ئەیووبی و پێشەوا قازی محەمەدم پێکەوە کردبوو. بارزانی بە تابلۆکەوە منی بردە لای پێشەوای سەرەک کۆمار. ئەویش پێی گوتم: ساڵی داهاتوو واتە ١٩٤٧ کۆمەڵێک قوتابی بۆ زانکۆی باکۆ ڕەوانە دەکەین، تۆیش بچۆ..».

# ئەسکەندەر جامباز
## (١٩٣٨ ـ ١٨/٨/١٩٩٤)

ئەسکەندەر عوسمان جامباز، هونەرمەندی نیگارکێشی ریالیزمی سەرەتایی، قوتابیی دانیال قەصاب و جەواد رەسووڵ ناجی، بە یەکێک لە پێشەنگەکانی هونەری شێوەکاری کوردی لە ساڵانی ١٩٦٠ -١٩٧٠ دەژمێردرێت.

**ژیانی کورتی هونەرمەند**

ـ لە هاوینی ١٩٣٨، لە هەولێر، لە گەڕەکی سەعدووناوە لەدایکبووە. لە قوتابخانەی اربیل اولی خوێندنی سەرەتایی و پاشان ناوەندی و ئامادەیی، ئنجا لە ١٩٦١ خانەی مامۆستایانی تەواوکردووە.

ـ لە ١٩٦١ کرایە مامۆستا لە گوندی سیساوەی ناحیەی حەریر.

ـ لە پایزی ١٩٦٢ بۆتە مامۆستای هونەری رەسم لە قوتابخانەی هەولێری سەرەتایی نموونەیی.

ـ ماوەیەک ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی کۆمەڵەی هەرەوەزیی پیشەسازییە میللی و دەستییەکان بووە.

ـ جگە لە رەسم، حەزی لە مۆسیقاش بووە. کەمانچەژەنێکی بەتوانا بوو.

ـ بە نەخۆشیی شێرپەنجە لە ١٨/٨/١٩٩٤دا لە هەولێر کۆچی دواییکرد.

ـ دوو رۆڵەی نیگارکێشی لەدووا بەجێماوە: ( جوان) و (هونەر ).

**بەهرەی هونەری و شێوازەکەی**

لە منداڵییەوە بەهرەی نیگارکێشانی هەبووە. کەلەپووری نەتەوەیی تا ئێستانی تێکەڵ بە کارە هونەرییەکانی ببوو. لە هەولێرەوە. لەبەر پیشەکەیان کە جامبازی بووە، هاتوچۆی دێهاتەکانی دەوروبەری هەولێری دەکرد. بەمە، ئاشنای سروشتی جوانی کوردستان بوو و لە بەرهەمەکانیدا

ڕەنگی دایەوە.
لە قوتابخانەی سەرەتاییدا قوتابیی منیر قصاب و دانیال قەصاب و جابیر پیرداود و عزالدین فیضی، لە قوتابخانەی ناوەندیشدا جەواد ڕەسوول ناجی و فوئاد ڕەسوول ناجی و پاشان محەممەد عارف دەرسیان پێ دەگوت. هاوڕێی نزیکی نیگارکێشی میللی، یوونس خطاط بوو. بەم شێوەیە، سوودی لە هەموو ئەوانە وەرگرتبوو.
لەگەڵ جەلال مەدحەت خۆشناو، سوداد عەتاولاغا، ئەدوارد سەلیم، حەسیب ڕەسوول ناجی لە مەرسەمەکەی مامۆستایان، جەواد ڕەسوول، ئیشیان کردووە. ئەو کاتە ئەسکەندەر عوسمان مامۆستای ئەربیل ئوولا بووە.
ناوبراو، لە هەر قوتابخانەیەکی دەرسی گوتبێتەوە، مەرسەمێکی کردۆتەوە و چەندین قوتابیی نیگارکێشی پێگەیاندووە. وانەی ڕەسم، لای ئەو، بەڕاستی وانەی ڕەسم بووە.
لە زەمانی گەنجێتیی ئەودا، لە سەرەتای پەنجاکاندا، وەک مامۆستا محەممەد عارف باسی دەکا: (هیچ کەش و هەوایەکی هونەریی ڕاستەقینە لە هەولێر نەبووە، جگە لە ناراستەکردنی چەند مامۆستایەکی هونەرپەروەر نەبێ کە خاوەن فەزڵن لەسەرمان). مامۆستا سلێمان شاکریش، لەبارەی بارودۆخی هونەریی شێوەکاریی سالانی پەنجاکان دەڵێ: ( مجلەی کەواکیب دیاریی تێدابوو: ڕەسمی ئەکتەرەکان، کە لێیان دەکردەوە و لە چایخانەکاندا هەڵیاندەواسی. هەموو هونەرمەندێکی شێوەکار حەزی لەو ڕەسمانە بوو، نەقلی دەکردن. خاوەنی چایخانەی عەبباس - گرامافۆنی لێ بوو - هەندێ لەو ڕەسمە نەقلکراوانەی لە نیگارکێشە هەولێرییەکان دەکڕییەوە و هەڵیدەواسین).
کەواتە، لەو سەردەمەی کە ئەسکەندەر عوسمان تازە گوڵی بەهرەی دەپشکوێت، لە ناوەڕاستی سالانی پەنجادا، هونەری ڕەسم لە کوردستاندا، بە بۆچوونی مامۆستایان محەممەد عارف و سلێمان شاکر: کز و لاواز بوو، هێشتا بەتەواوەتی لەدەست کۆپیکردن ڕزگاری نەبیوو. هەر لێرەشەوە، بایەخی ئەسکەندەر عوسمان دەردەکەوێت: چونکە ئەو، ئەگەرچی بەشێکی فراوانی تابلۆکانی زەمانی گەنجێتیی خۆی بریتی بوون لە کۆپی کردن و ڕاگوێستنەوەی بەرهەمی هونەرمەندانی تر، بەڵام دوواتر بەتایبەتی لە سالانی ١٩٦٠ و لە کۆتایی ژیانیدا رووی کردە داهێنان، پشتی بە خەیاڵ و بینین و ئەزموونی تایبەتی خۆی دەبەست.
سەرەڕای بۆچوونەکانی مامۆستایان محەممەد عارف و سلێمان شاکر لەبارەی دۆخی سالانی ١٩٥٠، دەتوانین سالانی ١٩٥٠ (واتە هونەری شێوەکاری لە سەردەمی نەوجەوانێتی ئەسکەندەر عوسمان) بەم شێوەیە بناسینەوە:
١- پەلوپۆ هاوێشتنی ئەم هونەرە بۆ ڕەنگ، بەکارهێنانی فایبەر و کوتاڵ و ڕۆن؛ تێکەڵکردنی کەرەستەکان؛ دوورکەوتنەوە لە خامە و خەڵووز.
٢- وردە وردە دوورکەوتنەوە لە نەقڵ کردن، رووکردنە داهێنان.
٣- ژمارەی نیگارکێشەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە: دانیال قەصاب و عەزیز سەلیم و جەواد ڕەسوول ناجی ڕێبەرایەتیی ئەم جموجۆڵە لە هەولێر دەکەن؛ لە سلێمانیش حەسەن فەلاح و خالید سەعید.

٤ـ لە ساڵی ١٩٥٢ بەملاوە هونەرمەندانی نیگارکێشی کورد، بەتایبەتی لە هەولێر و سلێمانییەوە، دەچنە پایتەخت و بەشێوەیەکی ئەکادیمی هونەری نیگارکێشی دەخوێنن.
٥ـ ژمارەیەک لە بەرهەمی نیگارکێشەکانی ئەو ساڵانە پارێزراون، دەبنە بەڵگەی سەلماندنی ئەو پێگەیشتنە هونەرییە.
٦ـ تابلۆ لە سەردیواری چایخانە و دیوەخان و ماڵە ئاغاکانەوە دەچێتە ناو خەڵک: لە پێشانگاکاندا پیشانی جەماوەر دەدرێن.
٧ـ رەنگدانەوەی کاریگەرێتیی شێواز و رێبازە هاوچەرخەکانی ئەورووپا، بەتایبەتی ریالیزم، بەسەر بەرهەمەکانی دانیال قەصاب و عەزیز سەلیم و فوئاد رەسوول ناجی و مونیر قەصاب و خالید سەعید.

ئەسکەندەر عوسمان، هەر چۆنێک بێت، لە سەردەمێکدا رووی کردۆتە ریالیزم و رەسمکردنی واقیعی کوردستان کە هونەری رەسمکردن تازە لە قۆناغی کۆپی کردن رزگاری بوو. بەشێکی فراوانی ئەو تابلۆیانەی کە دیمەنی قەڵا و منارە و سروشتی کوردستان و خەڵکی کوردن، زادەی خەیاڵ و داهێنانی شەخسی خۆین. بەڵام ئەوەش دەزانین کە تا کۆتایی ژیانیشی، هەر وازی لە نەقڵکردن نەهێنا، بەتایبەتی کۆپیکردنی تابلۆکانی منیر قەصاب و دانیال قەصاب.

دنیای ئەسکەندەر عوسمان، بەشێوەیەکی گشتی، بریتییە لە سروشت و کۆچ و ژیانی گوند و رەوەند و دیمەنەکانی قەڵا و منارە و ناو شاری هەولێر. لەبارەی رێبازی رەسمکردنیشی، هونەرمەند بۆ خۆی لە چاوپێکەوتنێکی گۆڤاری رەنگین دا دەڵێ: (زۆر سوودم لە رێبازە جیهانییەکان وەرگرتووە، بەتایبەتی ڤان کوخ، کە لای من زۆر مەزنە و تابلۆکانی و رەنگەکانی شوێنێکی تایبەتییان لە دڵمدا داگیرکردووە. رەنگە لە داهاتوودا پێشانگەیەک بۆ ئەو تابلۆیانەم بکەمەوە). مامۆستا محەممەد عارفیش، لەم بارەیەوە دەڵێ: ( هونەرمەند ئەگەرچی ئەکادیمیای هونەری تەواو نەکردووە، بەڵام سەر بە رێبازی ریالیزمی سەرەتاییە). مەبەستیشی لە ریالیزمی سەرەتایی لەوانەیە ئەوە بێت کە بەتەواوەتی پەیڕەوی بنکە و رێساکانی ریالیزمی نەکردووە و تابلۆکانی لەباری تەشریح و ئەکادیمییەوە لاوازن.

### تابلۆ و پێشانگاکانی

ـ یەکەم پێشانگاکانی بریتییە لە پێشانگا قوتابخانەییەکانی ساڵانی ١٩٦١ ـ ١٩٧٠. ـ گەلێک پێشانگای دیکەشی لە هەولێر و بەغدا کردۆتەوە.
ـ لە ساڵی ١٩٧٠دا، لەگەڵ جاڕدانی بەیانی ١١ی ئازار، تابلۆیەکی مەلا مستەفای بارزانیی کردبوو.
ـ ئەم تابلۆیانەی خوارەوە، لە ماڵی (مصلح جەلالی)ن: بووکگواستنەوەی بەر دەرکی قەڵای هەولێر، سێ ئافرەت ئەوت دەهێنن، تەشی رێس، تەشی فرۆش.
ـ زیاتر لە پەنجا تەختێت و تابلۆی، لە ماڵی خۆیدا، لای هونەری کوڕی، پارێزراون.
ـ چەند شاکارێکی براون بۆ سوێد و ئەڵمانیا و فەرەنسا.
تابلۆ ناودارەکانی، ئەمانەن: رەوەندێکی منداڵ بەکۆڵ، تەشی فرۆش، بووکگواستنەوە،

مەردۆشین، دمستار.
شاعیری ناسراو، ئیسماعیل بەرزنجی، کە قوتابیی ئەو بووە، دەڵێ کە لە ١٩٦٥دا، هەموو ڕۆژێک ئەسکەندەر عوسمان دیواری ناوەوی قوتابخانەکەی بە نەخشە و وێنە ڕەسم دەکرد. کاری دیوارنیگاریی زۆری کردووە. هەروەها چەندین جار کارتی جەژنانەی نەورۆزی ڕەسم کردووە و بەسەر قوتابی و لاواندا بلاویکردوونەتەوە. وانەی ڕەسم لای ئەو بایەخێکی زۆر و تایبەتی هەبوو.

**بەرهەمەکانی ئەسکەندەر عوسمان**

١ـ تابلۆ ( زەیتی و ئاوی و پاستێل).
٢ـ پەیکەری بچکۆلە و هەڵکۆڵینی سەر دار و ئەحت. نموونەی کارەکانی، لە ماڵی خۆیاندا پارێزراون.
٣ـ تەختێت و مووقەلەم.
٤ـ کاری تەصمیم و وێنەی ڕوونکاری، کە بۆ بەرگی کتێب و ڕوونکردنەوەی بابەتی نێو کتێبان کردوویەتی. کتێبەکەی کاک داود محمد شرۆل ( گوڵمێک لە ڕەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری) نموونەیەکی بەرچاوە.
٥ ـ دیوارنیگاری، بەتایبەتی لەسەر دیواری دیوی ناوەوەی ئەو قوتابخانانەی دەرسی تێدا گوتۆتەوە. ئەم هونەرەش (دیوارنیگاری) لەو ساڵانەدا، ئەگەرچی هەر لە ساڵانی ١٩٣٠دا لەسەر دەستی حەسەن فەلاح لە سلێمانی هاتۆتە ئارا، بەلام ئەسکەندەر جامباز بەشێوەیەکی جوان درێژەی پێداوە.
٦ـ جەژنانە لە شێوەی پۆستکارت. دیسان ئەم هونەرەش هەر لەو ساڵانەدا دەگمەن بووە و بە کارێکی تازەگەرا دەژمێردرێت.
بەم شێوەیە، ئەسکەندەر عوسمان پلە و پایەی تایبەتی خۆی هەیە لە جموجوڵی هونەری شێوەکاریی کوردیی ساڵانی ١٩٦٠ ـ ١٩٧٠دا. یەکێک بووە لە هونەرمەندانی قۆناغی کۆپیکردن و ریالیزمی سەرەتایی کە بەشێوەیەکی خۆرسک و سادە ڕێبازی ریالیزمیان چەسپاندووە.

# ئەنوەر سینو تووفی
# ( ١٩٢٧ . ١٩٩٤)
# یەکەمین سوریالیستی کورد

ـ لە ١٩٢٧ لە بامەڕنی لەدایکبووە، بنەماڵەکەیان لە گوندی تووفی لە کوردستانی تورکیاوە هاتوون.

ـ لە ناوەراستی پەنجاکاندا دار المعلمینی ریفی لە مووسڵ تەواوکردووە.

ـ لە زۆربەی پێشانگاکانی سالانی پەنجا و شەستەکانی سلێمانی و بەغدا هەوبەش بووە.

ـ دیکۆری بۆ گەلێک شوێن دروست کردووە لەوانە: بۆ یانەی فەرمانبەرانی سلێمانی، لە بواری شانۆشدا کاری کردووە و لە سلێمانی بۆ یەکەم جار تۆتێللۆی خستۆتە سەر شانۆ.

ـ نوێنەرایەتیی فێستیڤالی لاوانی لە ڤیەنا کردووە، لە ١٩٧١ نوێنەری لاوان بووە لە ئەلمانیا.

ـ بە یەکێک لە مامۆستایان و پێشەوای رەسم دەژمێردرێت لە کوردستاندا.

ـ لە ١٩٩٤ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

**چالاکییەکانی لە بواری دەرهێنانی شانۆیی و دیکۆری شانۆییدا**

١٣/ ٣/ ١٩٥٦

پیشاندانی شانۆنامەی ئافرەت و نوشتە نووسراوی کامیل ژیر، دەرهێنان و دیکۆری: ئەنوەر تووفی، لەلایەن قوتابیانی ناوەندیی شەو. رۆژنامەی ژینی ژمارە ١٣٣٧ی رۆژی ٢١/ ٣/ ١٩٥٧ لەسەری نووسیوە.

١٣/ ٣/ ١٩٥٦

پیشاندانی شانۆنامەی عوتێلۆ نووسراوی شکسپیر، وەرگێرانی: نووری وەشتی، دیکۆر و

دەرهێنانی: ئەنوەر تووفی، لەلایەن قوتابیانی ناوەندیی شەو.

پێنج شەممە ٩ تا ١٦/ ٨/ ١٩٥٦

پیشانگای کشتوکاڵی و پیشەسازی لە سلێمانی، کە میهرەجانێکی گەورەی هونەری رەسم و شانۆ و هونەری تر بوو بۆ ماوەی حەوت رۆژ.

١٩/ ١١/ ١٩٥٧

پیشاندانی شانۆنامەی تاوان و تۆڵە، نووسراوی نووری وەشتی، دەرهێنانی: ئەنوەر تووفی، لەلایەن کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان. دیکۆری خالید سەعید و ئازاد شەوقی. رۆژنامەی ژین ژمارە ١٣٦٥ ی رۆژی ٧/ ١٠/ ١٩٥٧ و ژمارە ١٣٤٤ی مانگی نۆڤەمبەری ١٩٥٧ باسی کردووە و رەخنەی لێگرتووە.

١٩٥٨/٢/٢٣

مەم و زینی ئەحمەدی خانی، ئامادەکردنی ئەمینی میرزا کەریم، دەرهێنان و دیکۆری: ئەنوەر تووفی، لەلایەن قوتابیانی ناوەندیی شەو.

تابلۆکانی ئەنوەر تووفی، لە سەرەتادا سادە و ریالیستیکی رووکەش بوون. پاشان بە سوودوەرگرتن لە سوریالیزم، ریالیزمی قووڵتر کردەوە و توانیی ناواخن و شێوەیەکی تازەی دیدی هونەرمەندانە بۆ خۆی دابهێنێت. سوودوەرگرتن لە هێڵ و تەکنیک و فۆرمە سوریالیستەکان و تەعبیرییەکان، بەئاشکرا دیارە لە تابلۆکانیدا. بەمەش، ئەنوەر تووفی دەبێتە یەکەمین هونەرمەندی نیگارکێشی کورد کە سوودی لە سوریالیزم وەرگرتبێت و لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگی دابێتەوە.

هونەرمەند، وەک زۆربەی نیگارکێشەکانی دیکەی ئەوسەردەم، لە بەستێنی ڕازاندنەوەی بەرگی کتێبانیشدا کاری کردووە. لە هەمان کاتیشدا ئەگەر یەکەمین هونەرمەندێکی کاریکاتۆریستیش نەبێت، ئەوا یەکێک بووە لە یەکەمین ئەو نیگارکێشانەی کە کاریکاتۆریان دروستکردووە و بڵاوکردۆتەوە. هونەری کاریکاتۆر لای ئەو، ناوەڕۆکێکی ڕەخنەگرانە و زمانێکی کۆمەڵایەتیانە هەیە لە بەرگێکی جوانی دەربڕینخوازدا.

هێڵی ئەنوەر تووفی زۆر جوان دەناسرێتەوە: ئاسک، تەعبیری، شەخسی، بەهێز، پڕ لە متمانە و ئەرک. فیگەرەکانیشی، لە واقیعی ئەمرۆیی کۆمەڵەوە هەڵدەهێنجا، بەڵام زۆربەی جار دەیخستنە ژێر باری بینینی فەنتازی و سوریالیستانەی شەخسی خۆیەوە.

## چەند ناوێکی دیکە..

لە هەمان ساڵانی ١٩٤٠ - ١٩٥٠ چە هونەرمەندێکی دیکە سەرقاڵی هونەری شێوەکاری بوونە: موفید حوسێن کەسرە، منیر قەصاب، زەکی بارۆخ (بەرەسەن جوولەکە، مۆسیقاژەنیش بووە، ستۆدیۆی رەسمی هەبووە)، فوئاد چەخماخچی، خەسرۆ جامباز، جەلال خۆشناو، سوداد عەتاولاغا، جەوهەر ئەحمەد ئاغای میرگەسۆری، ئەدوارد سەلیم، حەسیب رەسوول ناجی. هەروەها صدیق ئەحمەد عاشوور، محەممەد مەهدی، لەگەڵ د. عەبدوڵڵا ئەمین مەلا (مامۆستای

ڕەسم لە ناوەندیی کەرکووک) کە ڕۆڵیان دەبێت لە دامەزراندنی جماعە فنانی کرکوک.
هونەرمەندانی شێوەکاری نەسلی مۆدێرنی دووەم (سالانی ۱۹۵۰- ۱۹۷۰) کە بەرهەمەکانیان ڕسکاوتر و بە گڕێ و گۆڵترە و بریتین لە ئازاد شەوقی، محمد عارف، سلێمان شاکر، عەلی جۆلا، سەردار زوهدی، قوتەیبە شێخ نووری، شمس الدین فارس، کامل ئەحمەد مەعرووف (۱۹۳۹ سلێمانی)، مەحموود عەلی کاکی، عوسمان خال (۱۹۳۵ سلێمانی)، شێرزاد مەحموود شەوقی، نووری ئیسماعیل فەتاح، محمد حەمەسەعید حەسەن هەڵەبجەیی (۱۹۳٤)، محمد کاکە محمد (لە ۱۹۳٤ لە سلێمانی لەدایکبووە و لە ۱۱۹٦۱ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی تەواوکردووە)، یەحیا مەرجان، تاهیر ئیبراهیم فەتاح، قادر کوردی، کەریم دیار، سەعدەدین سەعید باتەیی (۱۹۳٤- ۱۹۹۸).. تۆژینەوەیەکی دیکەی تێروتەسەل و سەربەخۆیان پێویستە.

## محەمەد مەولوود قادر

لە ۱۹۳٦ لە کۆیە لەدایکبووە. مامۆستای دەرسی هونەر بووە لە قوتابخانەکانی هەولێر. لە بواری هەڵکۆڵینی دار زۆرتر کاری کردووە. خۆی بە قوتابیی دانیال قەصاب دەزانێ. لە دەیان پێشانگای هاوبەش و تایبەتی و بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەدا لە سالانی ۱۹۵۰ بەشداریی کردووە. ئەم تابلۆیەی کۆپیکردنی تابلۆیەکی دانیال قەصابە.

## جابر پیردواد

جابیر پیرداود، لەدایکبووی ۱۹۲۵: هەولێر، لە (۱۹٤۳) لە بەشی پەیکەرتاشی لە خانەی مامۆستایانی اعظمیە لە بەغدا وەردەگیرێت، لەوێ (قاسم ناجی) کە لە پاریس خوێندبووی، دەرسی هونەری پێ دەڵێتەوە و لە (۱۹٤٦) تەواوی دەکات.
هونەرمەند «لە ۱۹۳۵ بەولاوە بووە کە خووی دایە ڕەسمکردن، بەلام لە ۱۹٤۳ بەملاوە کار و بەرهەمەکانی بلاوبوونەوە. هونەر لە سەردەمی ئەودا واتە لە زەمانی عبدالکریم قاسمدا بووژایەوە». کۆتر سەلام ئەو خۆی دروستی کردووە. هەروەها هەیکەلی زەعیمی سەر ڕێگای مووسڵ، ئێستا نەماوە، ئەو دروستی کردبوو، لەگەڵ یاریکەرە وەرزشەوانەکانی سەر دیواری مەلعەلبی هەولێر. لە سالی ۱۹۵۸ بەولاوە بوو کە فێری پەیکەرتاشی بوو. لەگەڵ جەواد ڕەسوول ناجی، بە یەکێک لە یەکەمین پەیکەرتاشەکان دەژمێردرێت لە کوردستانی عیراقدا.
بە پێی گێڕانەوەی مامۆستا سلێمان شاکر، لە کۆڕەکەی خۆیدا لە گەلەریی ئەربێللا لە هاوینی ۱۹۹٦دا، جابیر پیرداود لە ۱۹٤۹ ـ ۱۹۵۰ لە کۆیە پێشانگای کردۆتەوە ئەقلی دیلاکرۆای کردبوو.

## فوئاد ڕەسوول ناجی

برای جەواد ڕەسوول ناجی، دوو قۆناغ پێش جابر پیرداود خوێندوویەتی. ماڵەکەیان، هەر سێ برا، لە گەڕەکی عەرەبان بووە، مەرسەمێکی گەورەیان لە ماڵەوە هەبووە و جابر دەچووە لایان بۆ

مەرسەمەکە. لە دار المعلمین خوێندوویەتی و پاشان بۆتە مامۆستای رەسم لە سانەویی هەولێر ئەجێی محافەزەی ئێستا. لە ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ جابر و ئازاد شەوقی لە وسائل الایضاح و وسائل التعلیمی پێکەوە کاریان کردووە.

فوناد لە کۆتایی ژیانیدا تێکچوو. برادەری جابر پیرداود بووە. تابلۆیەکی فوناد لای جابر پیرداود هەیە، دەیان تابلۆی دیکەش لە ماڵی جابری برا گەورەکەی و هاشم عبداللە پارێزراوە. کۆمەڵێکیش لە ماڵی خۆیان هەیە.

فوناد رەسوول ناجی بە چەقۆ نیشی دەکرد. هەندێ جاریش بە پالیتنایت وێنەی دەکێشا. هونەرمەندێک بوو رۆحی داهێنانی خۆی هەبوو. پشتی بە راگوێزانی تابلۆ نەدەبەست.

## شێخ جەمالەدین
## ( ١٩٢٣- )

کوڕی شێخ عوسمانی شێخ عەلائەدینی بیارەیە.لە ١٩٢٣ لە بیارەی هەورامان لەدایکبووە. حەوت ساڵ خوێندنی حوجرە و پاشان تا یەکی ناوەندی لە هەڵەبجە خوێندوویەتی. پەیکەرسازێکی بەسەلیقە و دەسڕەنگین بووە. زیاتر لە هەزار پەیکەری دروستکردووە، جارجار رەسمیشی کردووە. هەندێ لە کارە هونەریەکانی لە تاران پیشان دراوە و خەڵاتی وەرگرتووە. ئێستاش هەر لە داهێنان بەردەوامە و لە دەوروبەری مەریوان دەژی.

## قەدری حەیران

لە ١٩٣٤ لە زاخۆ لەدایکبووە.
دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدایە ساڵی ١٩٥٥
دەیان پەیکەری لە شارەکانی کوردستاندا دروستکردووە لە ساڵانی ١٩٥٠ - ١٩٧٠.

## سمە بولبول
## (١٢٨٥ هەتاوی - ١٩٧٨ی زایینی)

ئیسماعیل ساڵح ئیسماعیل لە ١٢٨٥ ی هەتاوی لە کوردستانی ئێران لەدایکبووە و لە دە ساڵی هاتۆتە ناوچەی شارەزوور و کەرکووک و پاشان سلێمانی. پەیکەرسازێکی لێهاتووی فطری بووە، بەسەلیقە و وردبین، لە خۆیەوە فێری ئەم هونەرە بووە. نیشە هونەرییەکانی لە هونەرەی ئەفریقییەوە نزیکن، دڵخۆشکەری منداڵای سلێمانی بوونە. لە شەقامی سابوونکەران دوکانی فرۆشتنی بەرهەمە هونەرییەکانی خۆی داناوە و بەوە ژیاوە. گەلێ جار بێگانەکان سەریان لە دوکانەکەی داوە و بەرهەمیان لێ کڕیوە.

# چەند بەڵگەنامەیەک

لەم لاپەڕەیەدا چەند بەڵگەنامەیەک وەک خۆی دەخەینە ڕوو کە لە دەفتەری سەردانی ئەو دوو پێشانگەیەوە وەرمانگرتووە کە بە سەرپەرشتیی هونەرمەند ئازاد شەوقی لە سالی ١٩٥٧ و ١٩٥٨ دا لە شاری سلێمانی سازدرابوون. هەر لە پارێزگاری شارەکەوە تا دەگاتە عبداللە گۆران و ئەنوەر تووفی و جەمال بەختیار و د.نەسرین فەخری و مستەفا سالح کەریم یاداشتی خۆیان تۆمارکردووە. ئەمەش مانای وایە کە هونەری شێوەکاری لەو زەمانەوە بایەخێکی گرنگی هەبووە لە کوردستاندا:

مدرسة متوسطة السليمانية للبنين

المعرض السنوي الدول

لرسوم وسائل الايضاح

تحت رعاية معالي متصرف اللواء

السبت ٦/٧/٩٥٧ تموز

زمن الزيارات

قاعة المعرض - بناية روضة الاطفال

يوم الافتتاح - السبت ٦/تموز ٧/٩٥٧

في الساعة الخامسة ازوالية

# سەرچاوە کوردییەکان

**(کتێب و گۆڤار ورۆژنامە و چاوپێکەوتن):**

حوسێن حوزنی موکریانی: مێژووی عەکاسی و فروعاتی ، زاری کرمانجی ، ژ(٢٠)، رواندز : ١٧ / ٨ / ١٩٢٩

فازڵ قەرەداغی : چیرۆکی شمشارد، باسێکی مێژوویی شمشاردی دەشتی رانیە، چاپی دووەم، سلێمانی : .١٩٩٦

تاکیرۆ ئاکازدا : راپۆرتێک لەسەر کۆمەڵێک ئاسەواری چاخی بەردینی ناوەراست لە ئەشکەوتی شانەدەر ، شێروان کردوویەتی بە کوردی ، گۆڤاری هەزار مێرد ، ژمارە (٣) ، سلێمانی : ١٩٩٨، ل ٨٠ - ٨٧

گەزنەفۆن : ئاناباز ، و : فەرهاد پیرباڵ ، رابوون ، ژمارە (٧ - ٨) ، ستوکهولم : ١٩٩٣

مێژووی چاخە کۆنەکان، بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی ، داتانی: د. فوزی رشید ، صباح الطائی ، کامل التکریتی ، چاپخانەی الحکومە ، بغدا : ١٩٧٦ ، ل ١٥ - ١٠٩

اسماعیل بادی : پەیکەری برۆنزی بێ باسکی ، گۆڤاری دهوک و ژ ١ ، ل٣٧ - ٤٧، ساڵی ١٩٩٧ .

کمال نوری معروف : گۆڤاری هەزارمێرد ، ژ ٣ / ١٩٩٨ / ل١٢

کامیار عەبدی : هونەری سەردەمی ماد ، و . لە فارسیەوە : حسن عبدالکریم ، هزارمرد ، ژ (٧) ، سلیمانیە : ١٩٩٩ ، ل٥٣ -

عبدالرحمن پاشا : بێستون ، گۆڤاری ئاوێنە ، ژمارە (٢٤-٢٥ ) ، تاران : ١٣٧٥ ، ل ٥٧

جعفری مهرکمان : مێژووی لێکۆڵینەوە لەسەر (نەخشە هەڵکەندراوە بەردینەی - لە ئێران و ، و : حەسەن عبدالکریم ، هەزارمێرد ژمارە (٤) ، سلێمانی : ١٩٩٨ ، ل٩٥ - ١٠٢ .

محەمەدی مەلا کەریم : رازی یەکێک لە دڵدارییەکانی مێژوو ، گ. بەیان ژمارە (٥) کانوونی دووەمی ١٩٧١ بەغدا، ل٢٧ - ٣٢ .

کمال نوری معروف : گۆڤاری هەزارمێرد ، ژ ٤ ، ١٩٩٨ ، ل ٥ - ١٤

عبدالرقیب یوسف: تابلۆ هونەرییەکانی شەرەفنامەی دەستخەتی شەرەفخان، گ. رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٥ و ١١٧، ساڵی ١٩٨٧ و ١٩٨٨.

یاسین قادر، گۆڤاری هەزارمێرد ، ژمارە ، ژمارە (٥) ل ٤٦ - ٤٩ . هەروەها گۆڤاری شانەدەر، ژ ١ ، ل٥٤

د. جەمال رەشید: لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، لاپەڕە ٦٥-٦٦ ، ٦٨-٦٩، ٢٦٧، ٢١٦، ٢٨٣-٢٨٤، ٣٠٦.

لەتیف قەرەداغی: بنیاتنانی شاری سلێمانی و کتێبخانە بازرگانییەکانی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١١٠، ١٩٨٦، ل ٢٣٣ ـ ٢٤٠.

گوتوبێژ لەگەڵ مهندس معتمدی ، ئامادەکردنی عومەر فاروقی ، گۆڤاری سروە ژمارە (١٢١) ، نورمێ : ١٣٧٥ ، ل ٤٥ - ٤٩

زاری کرمانجی، ژ ۲۰ ، ۱۷ی تۆکەستی ۱۹۲۹، وتاری مێژووی عەکاسی و فرووعاتی ل ۱۰ ـ۱۲.

ئەحمەد سەعید ئەحمەد: کورتەیەک لەبارەی هونەری خۆشنووسی، رۆشنبیری نوێ، ژ ۱۰۹، س ۱۹۸٦، ل ۳٥۹ ـ ۳٦٥.

بەهمەنی کەریمی: لورستان، و: خالد رەسوول، بلارکراوەی گەلەریی زاموا، سلێمانی: ۱۹۹٥، ل ٤ ـ ۱۰.

عبدالرقیب یوسف: تابلۆکانی شەرەفنامە، بلاوکراوەی وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر - ۱۹۹۸.

فەرهاد پیربالْ: کورد و رەنگ دوو جمکانەی لەیەکتر نەترازاو، ناساندنێکی کرۆنۆلۆژی، گۆڤاری یەکگرتن، ژمارە ۱۷، کۆپنهاگن: ۱۹۹٥، ل ۲۸۰- ۲۸۳.

گۆڤاری هەتاو، ژمارەکانی ۲۹، ۱۰۳، ۱۱۱، ۱٤۳، سالی ٥٦ و ۱۹٥۷.

گۆڤاری یەکگرتن، ژ ۱۳ و ۱٤ چەند وتارێک لەبارەی هونەری شێوەکاریی کوردی.

رەهبەر جەلال: هونەری شێوەکاریی کورد، گۆڤاری دلانپار، ژ ۲، فنلەندا:۱۹۹۲.

مەحموود زامدار: رەنگ و نیگار، رۆژنامەی بارزان، ئەمریکا، ژ ۱۱، ۱۹۹۲.

دوو هونەرمەند( سلێمان شاکر و دلێر شەریف)، گۆڤاری رامان، ژمارە ( ۱٥ )، هەولێر: ۱۹۹۷، ل ۸٥ - ۹۰.

مستەفا زدنگەنە: د. عەبدوللا ئەمین مەلا، گ. هاواری کەرکووک، ژمارە ( ۱ )، هەولێر: ۱۹۹۸، ل ۸٥ - ۸۷.

پێشانگای گشتی هونەرمەندانی کورد، هەولێر: ۱۹۸٦. بلاوکراوەکانی ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیری و لاوان.

یادێکی هونەرمەند جەواد رەسوول ناجی، رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ۲۲۱۲، سالی ۱۹۹٦.

محەمەد تەیموور: دەروازەیەکی رەخنەیی درامای نوێی کوردی. گۆڤاری کاروان، ژمارە ٦٤، مایسی ۱۹۸۸، ل ٦۰ - ۷۰.

محەمەد تەیموور: شانۆ لە قوتابخانەکاندا، گ. نوتۆنۆمی، ژ ۲۱، ۱۹۸٤، ل ۱۰٥ - ۱۱۲.

محەمەد تەیموور: دربارەی دراما و رەخنە، گۆڤاری کاروان، ژ ٤۱، هەولێر: سالی ۱۹۸٦، لاپەرە ٦۳ ـ- ۷۰.

قادر میرخان: هاوپەیڤین لەگەلْ سەردار زوهدی، گۆڤاری ئێستا، ژمارە ( ۱٥ )، سلێمانی: ۱۹۹۸، ل ٦۹ - ۸۰.

تاهیر ئەحمەد حەویزی: شانۆگەری لە کوردستاندا، رامان، ژمارە ( ۲۷ )، ل ۲۰٥ - ۲۰٦.

کۆشەی هونەرمەندانی کورد، لە گۆڤاری بەیان، ژمارە ۱ - ۳۷، بەغدا: ۱۹٦۹ - ۱۹۷۳.

جابیر پیرداود، سازدانی گفتوگۆ: مەحموود زامدار و ئازاد عەبدولواحد، گ. (رامان)، ژ(۱۸)، هەولێر:۱۲/۱۹۹۷، ل ۷۸ - ۸۳.

عومەر عەلی ئەمین: نموونەی نیگاری فۆلکلۆری کورد، گ. کەلەپووری کورد، ژ (۱۳)، سلێمانی: زستانی ۲۰۰۰.

تاریق کاریزی: جەمال بەختیار و دیمانەیەک، ر. برایەتیی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٤١)، ١٩٩٨/٨/٢٧
دیوان شێخ نووری شێخ سالح، ئازاد عەبدولواحید کۆی کردۆتەوە و لەسەری نووسیوە، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، د. ر. ب. ک.، بەغدا: ١٩٨٩، ل (٢٠٣).
دیوانی صافی، کۆکردنەوەی گیوی موکریانی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ل ٧٨.
عومەر عەلی ئەمین: ڕووناکییەک بۆ سەر مێژووی هونەری وێنەکێشان لە سلێمانی، رامان، ژمارە (٣٠)، هەولێر: ١٩٩٨، ل ١٩٤ ـ ١٩٨.
ناهیدەی شێخ سەلام: ئەوەی لەبیرم، ئامادەکردنی: چنوور سالح، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر: ١٩٩٩، لاپەڕە ٩٧ ـ ٩٨.
د. فەرهاد پیربال: کوردستان لە چاخی بەردینی ناوەند دا ١٣٤٠٠ ساڵ پێش ئەمڕۆ، لە ئەشکەوتەوە بۆ گوند، گ. شانەدەر، ژمارە ( )، هەولێر: ١٩٩٨
ئەرشیفی گەلەریی زاموا لە سلێمانی و گەلەریی ئەربیللا لە هەولێر. هەروەها ئەرشیفی ماڵی ئەسکەندەر جامباز و جەواد رەسوول ناجی لە هەولێر، لەگەڵ ئەرشیفی هونەرمەند سامانە رەش..

ئەکرەم مەحمود سالحەرەشە: شاری سلێمانی، ب ١و ٢، ل ١٥٦.
یادێکی هونەرمەند جەواد رەسوول ناجی، رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٢٢١٢، ساڵی ١٩٩٦.
وتارێکی مومتاز حەیدەری لە گۆڤاری نووسەری نوێ، ژمارە ٣ /١٩٧٨.
ئەحمەد سەعید ئەحمەد: کورتەیەک لەبارەی هونەری خۆشنووسی، رۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٩، س ١٩٨٦، ل ٣٥٩ ـ ٣٦٥.
فەردین سادق ئەییوبی : مێژووی جل و بەرگی کوردی ، و : دەستەی نووسەران ، گۆڤاری (ئاوێنە) ، ژمارە (١٣) ، تاران : ١٣٧٢ ، ل٥٨ - ٦٣
گۆڤاری هەتاو ژمارەکانی ٢٩، ٣، ١٠٣، ١١١، ١٤٣، ساڵی ٥٦ و ١٩٥٧.
چاوپێکەوتن لەگەڵ محەمەد عارف، گۆڤاری رامان، ژمارە ٧، کانوونی دووەمی ١٩٩٧، ل ٣٩ - ٤٥.
دوو هونەرمەند( سلێمان شاکر و دلێر شەریف)، گۆڤاری رامان، ژمارە ( ١٥)، هەولێر: ١٩٩٧، ل ٨٥ - ٩٠.
جابیر پیرداود، سازدانی گفتوگۆ: مەحمود زامدار و ئازاد عەبدولواحد، گ. (رامان)، ژ(١٨)، هەولێر:١٩٩٧/١٢، ل ٧٨ - ٨٣.
تاهیر ئەحمەد حەوێزی: شانۆگەری لە کوردستاندا، رامان، ژمارە ( ٢٧)، ل ٢٠٥.
سلێمان شاکر: هەولێر و هونەری شێوەکاری، گ. رامان، ژمارە ( ٢٩)، هەولێر: ١٩٩٨/١١، ل ١٥٧ ـ ١٥٨.
تاهیر ئەحمەد حەوێزی: چەند تێبینییەک دەربارەی دانیال قەصاب، دەنگی میللەت، ژمارە ( ٤٢): ١٩٩٩/١/١٥.
بورهان هەژار: هاوپەیڤینێک لەگەڵ عەزیز سەلیم، هاوکاری، ژ ١١٤٩.

رەهبەر جەلال: هونەری شێوەکاریی کورد، گۆڤاری دلانپار، ژ ٢، فنلەندا: ١٩٩٢.
چاوپێکەوتن و دیداری بنەماڵەی جەواد رەسوول ناجی، بەتایبەتی کاک ئازاد و ناراس خان.

جابیر پیرداود، سازدانی گفتوگۆ: مەحموود زامدار و ئازاد عەبدولواحد، گ. (رامان)، ژ(١٨)، هەولێر: ١٢/١٩٩٧، ل ٧٨ - ٨٣.
محمد تیمور: دراماى نوێى کوردی، کاروان، ژ ٦٥، ١٩٨٨، ل ٦٥ ـ ٦٩.
مەغدید حاجی: یەکەمین قوتابخانەی هەولێر، رۆژنامەی (برایەتی)، ژمارە (٢٥٥٠)، رۆژی ١٩٩٨/٣/٢٩، دووا لاپەرە.
خالید رەسوول: دووا دیداری هونەرمەندی شێوەکار خالید سەعید، ئا: بەختیار سەعید، ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ، ژمارە (٢٦٣٨) رۆژی ٢٠٠١/١٢/٢٠
مسعود سعید یاسین: سەعدەدین ئەسعەد، گ. هونەر، ژمارە (٤)، دهۆک: ١٩٩٩
ن. دهۆک/ئیسماعیل: ب هەلکەفتنا بورینا سالەکی لسەر وەغەرکرنا سەعدەدین باتەیی، ر. برایەتیی ئەدەب و هونەر، ژمارە (٢٤)، ١٩٩٩/٤/٣٠
شوکر مستەفا: لەبارەی بەدیع باباجان، گ.رامان ژمارە ٢٧.
اسماعیل بادی: پەیکەرێ برۆنزێ یێ باستکێ، گ. دهۆک، ژ (١)، ١٩٩٧، ل ٣٧
داود محمد شرۆڵ: گۆلمێک لە رەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری، الحوادث، بەغدا: ١٩٨٧.
ئیسماعیل بەرزنجی: رەنگرێژی خەمە کوردییەکان، کوردستانی نوێ، هەولێر: ١٩٩٤/٨/٢٨.
تاریق کارێزی: بەدەم کۆچی دووایی مامۆستا ئەسکەندەردوە، برایەتی، رۆژی ١٩٩٤/٩/١٣.
لەبارەی کۆچی دووایی مامۆستا ئەسکەندەر، رۆژنامەی برایەتی، رۆژی ١٩٩٤/٤/٢١.
هێڤی: سی ساڵی هونەری شێوەکاری، گۆڤاری رەنگین، بەغدا: ١٩٩٣، ل ١٦.
سلێمان شاکر، لە کۆرەکەی خۆیدا لە گەلەریی ئەربێللا لە هاوینی ١٩٩٦دا.
چاوپێکەوتن لەگەڵ محەممەد عارف، گۆڤاری رامان، ژمارە ٧، کانوونی دووەمی ١٩٩٧، ل ٣٩ ـ ٤٥.
رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٢٢١٨، هەولێر: ١٩٩٦/١١/٢٤ وێنەیەک ل٨.
چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی لەگەڵ عەزیز سەلیم لە تەلەفزیۆنی گولان لە مانگی ١٩٩٧/١٠ پیشاندراوە.
چاوپێکەوتنی ئازاد شەوقی بە کامێرای تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان لە ١٩٩٥/٧ لە سلێمانی. پیشان نەدراوە.
چاوپێکەوتنی بنەماڵەی جەواد رەسوول ناجی، بەتایبەتی کاک ئازاد و ناراس خان لە ١٩٩٦/١٠.
بەرنامەی چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی لەگەڵ جابیر پیرداود، محەممەد عارف، محەممەد حەسەن لەبارەی پەیکەرتاشی لە کوردستاندا، تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان لە ١٩٩٥/٧ لە هەولێر پیشاندراوە.

نامەیەکی تایبەتی کاک خالد رەسوول، مانگی حەوتی ١٩٩٥
نامەیەکی تایبەتی کاک کەمالّ رەئووف، مانگی حەوتی ١٩٩٥.
سلێمان شاکر، لە کۆڕدکەی خۆیدا لە گەلەریی نەربیللا لە هاوینی ١٩٩٦دا.
ئازاد شەوقی، لە کۆڕدکەی خۆیدا لە گەلەریی نەربیللا لە هاوینی ١٩٩٦دا. بە ڤیدیۆ پارێزراوە.
شوکور مستەفا لەبارەی بەدیع باباجان دەدوێ، ڕامان ژ (٢٧).
بەدیع باباجان: تابلۆ وێنەیەک، بەیان، ژ (٤)، بەغدا، ١٩٧٠.

## سەرچاوە فارسییەکان

(کتێب و گۆڤار ورۆژنامە):
فەرهەنگی برهان قاطع، چاپ پیروز، طهران: ١٣٣٦، ص ٧٣ باسی کردووە. چەلەبی: سیاحەتنامە
س . ماسلنیتسینا : هند ایران ، تنظیم و تدوین : ناصر پور پیرار ، نشر کارنگ ، طهران : ١٩٩٥ . ص ١١
آرتور پوپ : آشنایی با میناتورهای ایران ، ت : حسن نیر ، مرکز نشر کتابهای طراحی و نقاشی ، طهران : ١٩٩٨ ، ص ٧ - ٩
فریدون بیگلری : تاریخچە تحقیقات باستانشناسی در کرمانشاه ، آوینە لا ژمارد (١٧ - ١٨ ) . تاران : ١٣٧٥ ، ل ١٠٦ - ١٠٨
فیلیپ اسمیت : تپەگنج ددرە و (غار خر) در کرمانشاه ، ت : فریدون بیگلری و سامان حیدری ، مجلە ئاوێنە ، شمارە (٢٦ - ٢٧) طهران : ١٣٧٥ ، ص ١١٢ - ١١٥.
علي تقوی : جمهور اسلام و برخورد کردها با ژن ، / وینە ژمارە ، ٣٢ - ٣٣ ، ل ٩٠ - ٩٥
م . آ . داندا مایف : ایران در دورە غنستین پادشاهان هخامنشی ، ترجمە : روحی ارباب ، طهران : ١٩٧٨
حبیب الله صمدی : کردستان در چهل هزار سال پیش، مجلە (بغستان) جلد اول. شمارە اول، ص ٣٨-٣٩. طهران : ١٩٦٣.

## سەرچاوە عەرەبییەکان

(کتێب و گۆڤار ورۆژنامە):
شاکر حسن آل سعید: البیانات الفنیة في العراق، دار الحریة، بغداد:
محمد حسین جودي : تاریخ الفن العراقي القدیم ، مطبعة الضمان ، بغداد : ١٩٧٤ / ص ٣٩ و ٢٣٠ - ٢٣٤
جورج مارسیمة : الفن الاسلامي ، ت : د . عفیف بهنسي ، منشورات وزارة الثقافة ، دمشق : ١٩٦٨ ، ص٢٠١

فؤاد سفر : المرشد الي مواطن الآثار والحضارة ، المرحلة الخاصة ، بغداد : ١٩٦٦ ، ص ١٥ - ١٩ .
حضارة العراق ،تاليف : نخبة من الباحثين العراقين ، ج٣، دار الحرية ، بغداد : . ١٩٨٥
د .تقي الدباغ : الفخار في عصور ما قبل التاريخ ، حضارة العراق، ج ٣ . بغداد : ١٩٨٣.
طه باقر : مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة ، بغداد : ١٩٨٦
طارق عبدالوهاب مظلوم : النحت من عصر حجر السلالات حتى العصر البابلي ، بحث في (كتاب حضارة العراق) ، ج٢ ، بغداد : ١٩٨٥ ، ص٤٤ .
صفوت الجراح: ذكريات، جريدة خبات، اربيل: ١٩٩٧/٦/٦
زهير عبدالمسيح: اول مسرحية كردية في رواندز، جريدة العراق، صفحة الثقافة الكردية: ١٩٧٨/٥.
كمال ردنووف: اول مدرسة للانارة في السليمانية، جريدة العراق، ع ٣٠٦٧ في ٢٧ / ٢ / ١٩٨٦.
جبرا ابراهيم جبرا: الفن الحديث في العراق في كتاب الحرية و الطوفان، بيروت: ١٩٦٠. ص ٢١٦ و ٢٣١.
د. سلسل العاني: عناصر اسلامية و عربية في جانب من اعمال جواد سليم، افاق عربية ع ١و٢ السنة التاسعة، بغداد: ت١، ١٩٨٣، ص٧٥ و ٢٣١.
شاكر حسن ال سعيد: فصول من تاريخ الحركة التشكيلية في العراق، الجزء الاول، منشورات وزارة الثقافة و الاعلام (٥٢)، بغداد: ١٩٨٣، المجلد الاول و الثاني.
دليل معرض تصاوير من شمال العراق ( من ٢٧ تشرين الثاني الي ٣ كانون الاول لعام ١٩٥٥). من وثائق جمعية اصدقاء الفن المحفوظة في ارشيف الفنون التشكيلية في بغداد: الارشيف التشكيلي، ملف عطا صبري.
متحف الفنانين الرواد، مطبوعات وزارة الثقافة و الاعلام - دائرة الفنون التشكيلية، اعداد عباس جاور، بغداد. جةمال رةشيد: الفنان البداني حسن فلاح، رؤشنبيري نوى، ژماره ٥، بةغدا: سالى ١٩٧٤.
جةمال رةشيد: حسن فلاح، جريدة التاخي العربية، العدد ( ١٣١٤)، بغداد: ١٩٧٣/٤/٢٣.
حمدي خلف: اوراق من حركة الفن التشكيلي في العراق، مجلة الاذاعة و التلفزيون، بغداد: ص ٣٦ - ٣٩.
كمال نوري معروف : كهف كوندوان و منحوتاته البارزة ، سومر عدد ٤٥ ، ١٩٨٧ - ١٩٨٨ وةرگيران : محمد
نسرين خواكرم : كنز زيويه ، مجله هزارمرد ، عدد (٦) السليمانيه : كانون الاول ١٩٨٨ ، ص١٨٤ - ١٩٥ .
ارنست بابلون : الاثار الشرقية ، نقلة الي العربية : مارون عيسى الخوري ، دار حكمت

شـريف ، لبنان: .١٩٨٧ص٨١- ٨٢ ٨٩/-٩٠ / ١٠٣-١٠٧ / ١١٥ / ١٢٠ / ١٢٦ / ١٢٧ / ١٣٩ .

نسرين خواكرم : كنوز لرستان ، هزارميرد ، ژماره (٢) سليماني : ١٩٩٨ ، ل١٥٤ - ١٧٢

نسرين خواكرم: الميتانيون، گوڤارى هەزارمێرد، ژ (٣)، سليمانى: ١٩٩٨، ل ١٩٤

فرج بصمەجي : البرنزيات اللرستانية ، مجلة سومر ، ج١ ، ج٢ ، بغداد : ١٩٦٣ ، ص٤١.

د. جمال رشيد : تاريخ الكورد القديم ، منشورات جامعة صلاح الدين ، اربيل : ١٩٩٠

رافدة عبداللة عبدالصمد : فخار عصور ما قبل التاريخ في كوردستان العراق مجلة (هزارمرد) ، عدد : ٢ ، السليمانية : ١٩٧٧ ، ص. ١٧٢

د. عبدالهادي الفؤادي : كتابات و نقوش اثرية في بيتواتة ، ت : روند عبدالقادر ، شانەدەر ، ژ (٥) ، ص ٨١

ارنست فيشر: الاشتراكية و الفن، ت: اسعد حليم، ص ٢٧.

شوكت الربيعي: مقدمة في تاريخ الفن العراقي، الموسسة العامة للصحافة و الطباعة، بغداد: ١٩٧٠، ص ٤.

الفن التشكيلي الكردي، جريدة التاخي، ٢٥/٨/١٩٧٠، ص ٣.

# سەرچاوە فەرەنسی و ئینگلیزییەکان

(کتێب و گۆڤار ورۆژنامە):

G. P. BADGER: The Nestoriens and their rituals, London, 1852.

U. Bahadir Alkim :Archeologie d Anatolie, ed . nagel, Paris: 1968.

Hugh Honour , J . FLGMING: Aworld History Of Art, 3 ed., London: 1991, P . 20 - 29.

Prof . Robent J. BRAIDWOOD: The Iraq - Jarmo projeet, in Sumer, v . 2 . Baghdod : 1954 .

P . AMIET : L Art Antque, dm proche orient , paris : 1973

Jean DELORM :chronoiolgie des civilisations , Presse in . F . , 4 ed . , Paris : 1969

Gagine Boudet : chronolegie universelle , ed . Bordas , Paris : 1983

Dr. oktay Belli : Van Capital de e Urartu , ed . net, Istanbul ,4 me ed . 1989 . p . 8

At Jarmo Storage Pits Wese lined With Clay baked in Situ , Pottery Vessels and figurines of cly Were alse b eing made these.

J. Deihayes : L orient ancien , P 52 - 527

Ancient Civilislion, Visuol World
Librony, Hong Kong : 1978, p : 36 - 37

Iraq . Mesopotamie
hier et aujourd hw.
Ed. Sartee, Lausanne

M. STREOK: (IRBiL) in Encyclopedie de I Islam, T . 2,
E - k . paris : 1927.

Pierre Amiet : Liart antiqve du Proche - Orlenu , eod . Mazenod , Paris . : 1977 . tf p . 537 .

K. YEKTIN: L ancienne peinture turque, ed. klincksieck, Paris: 1970.

The Sampsan Law : Ancient Civilization, Edit or : F . M . Clhpham, U . K . : 1978 , p . 640 .

A . Godasd : Le Tresor de Ziwiye Harlem : 1950 3) R .

O . Barnet : The Treasure of Ziwiye . Iraq , Xvlll (1956 ) . P P . 111 - 116

